

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**●ئیتیکی کاری رۆژنامەوانی**

- ئامادەکردنی: هاوژین عومەر
- نەخشەسازی ناوەوە: رەسووڵ
- بەرگ: هێمن خدر
- ژمارەی سپاردن: ()
- نرخ:
- چاپی یەکەم: دەزگای موکریانی ٢٠١٢
- تیراژ:
- چاپخانەی خانی دهۆك

زنجیرەی کتێب()



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com



# پێڕست

## پێشەکی

ئیتیکی ڕۆژنامەگەری بابەتێکی گرنگ و هەستیاری ئەمڕۆی دونیای ڕاگەیاندنە،شانبەشانی یاساکان ڕۆڵی گرنگ لە ڕێکخستنی کاری میدیایی،و هاوسەنگی دروستکردن لە نێوان بەرپرسیارییەتی و مافەکانی ڕۆژنامەنووس دەبینێ،هەروەها گرێدراوی فەلسەفە و ئایین و بیردۆزە ئیعلامییەکانە،وابەستەییەکی توندیشی بە ئازادی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندنەوە هەیە.لە ئیتیکدا ویژدانی پیشەکار دادەر و جێبەجێکارە،بە پێچەوانەی یاساکان پێویستی بە دەسەڵاتی جێبەجێکردن نییە،پێشکەوتنە بەردەوام و یەك لەدوا یەکەکانی تەکنەلۆژیای گەیاندن و پەیوەندیکردن،و بە گوندبوونی جیهان،هێندەی دیکە مەسەلەی ئەخلاقی پیشەییان گرنگ و پڕبایەختر کردووە،نەخاسمە لەگەڵ فراوانبوون و پان وپۆڕبوونی میدیای ئەلیکترۆنی و نەبوونی یاسای تایبەت بە ڕێکخستنی کاری ئەم شێوە میدیایە لە زۆربەی وڵاتاندا.

ئەگەرچی ڕەگە هزرییەکانی ئەم بابەتە بۆ سەدەیەك پێش ئیستا دەگەڕێتەوە،کەچی هێشتا سەروکاڵی میدیای ڕۆژهەڵات و وڵاتانی جیهانی سێیەم لەگەڵ ئەم بابەتە سەرەتایی و تازەیە،بەتایبەت لە هەرێمی کوردستاندا زۆربەی میدیاکاران زانیارییەکی ئەوتۆیان دەربارەی نییە،بێگومان فاکتەرەکانی ئەم حاڵەتە زۆرن،بەڵام لەسەرووی هەموویانەوە هەژاری کتێبخانەی کوردییە لە کتێبی میدیا بەگشتی و دەربارەی ڕۆژنامەگەری کوردی بەتایبەتی،تایبەتتریش نەبوونی هیچ سەرچاوەیەکی کوردییە کە بەتایبەت باس لە ئیتیکی ڕۆژنامەگەری و بایەخ و حزوری لە میدیای کوردیدا بکات.پێموایە کەمی کتێبی زانستی دەربارەی میدیا گوناهە سەرەکییەکەی هێندەی پەیوەنداری سیاسەتی ڕژێمەکانی پێشووە کە هەردەم بەشێوازی جیاجیا هەوڵی تەسککردنەوەی ئەم بوارەی داوە لەبەردەم تاکی کوردی،هێندە ڕۆشنبیر و نووسەرانی کورد لێی بەرپرسیار نین.

بەندە بەهەستکردن بەم بۆشاییە،لە هەوڵێکدا بە سوودوەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەکی نوێی عەرەبی،خوازیارە لەڕێگەی ئەم کتێبەوە(ئیتیکی کاری ڕۆژنامەوانی) سوودێك بە میدیاکاران و فێرخوازانی بەشەکانی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن لە پەیمانگا و کۆلیژەکانی کوردستان

بگەیەنیّ،بۆیە هەولّمداوە بەزمانێکی سادە و ئاسان بابەتەکە بخەمەڕوو، و بە پشت بەستن بە بنەما ئەکادیمییەکان تیشك بخەمە سەر گرنگی پرسی ئیتیك لە کاری رۆژنامەگەری،و حزوری ئەم بابەتە لە میدیای کوردی شەن و کەو بکەم،ئەم کتێبە لەگەلّ ئەوەی ناونیشانی(ئیتیکی کاری رۆژنامەوانی)هەلّدەگریّ،وەلیّ لە دەروویەکدا رۆشنایم خستۆتەسەر یاسا نێودەولّەتییەکانی راگەیاندن و یاسای رۆژنامەگەری کوردستان،لەگەلّ تۆمارکردنی چەند رەخنە و سەرنجێك دەربارەی،چوار دەرووەکەی دیکەشم تەرخان کردووە بۆ تیشکخستنەسەر چەمك و پێناسە و سەرهەلّدان و بنەما و گرنگی ئیتیك،و جۆرەکانی پەیماننامەی شەرەفی ولاّتان و چەند دەزگایەك دەربارەی رێکخستنی کاری میدیایی، و ئیتیکی رێکلامکردن،و ئامادەگی ئەم بابەتە لە میدیای کوردی،و مەسەلەی ئازادی رادەربڕین و سیستەمەکانی راگەیاندن ،دەخوازم ئەم هەولّەم جێی سوود بیّ،چونکە بەپێی زانیارییەکانی من ئەمە یەکەم کتێبە بە زمانی کوردی بەو چڕوپڕییە باس لە ئەخلاّقیاتی کاری راگەیاندن دەکات،بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا بیّ کەموکوڕی و تەواو تێر وپڕ نییە، بەو پێیەی بابەتەکە زۆر هەلّدەگریّ، و پەرەسەندنەکانی بواری میدیاش چ وەك تیۆر و چ وەك پڕاکتیك لەپەرەسەندنی بەردەوامدان.

# دەرووی یەکەم

## ئیتیکی رۆژنامەوانی و ئازادی رادەربڕین

### بەشی یەکەم: ئازادی رادەربڕین و سیستەمەکانی راگەیاندن

### بەشی دووەم: ئیتیکی رۆژنامەوانی (چەمك و سەرهەڵدان)



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**●ئیتیکی کاری رۆژنامەوانی**

● ئامادەکردنی: هاوژین عومەر

● نەخشەسازی ناوەوە: رەسووڵ

● بەرگ: هێمن خدر

● ژمارەی سپاردن: ()

● نرخ:

● چاپی یەکەم: دەزگای موکریانی ٢٠١٢

● تیراژ:

● چاپخانەی خانی دهۆك

زنجیرەی کتێب()



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com



## پێڕست

# پێشەکی

ئیتیکی ڕۆژنامەگەری بابەتێکی گرنگ و هەستیاری ئەمڕۆی دونیای ڕاگەیاندنە،شانبەشانی یاساکان ڕۆڵی گرنگ لە ڕێکخستنی کاری میدیایی،و هاوسەنگی دروستکردن لە نێوان بەرپرسیارییەتی و مافەکانی ڕۆژنامەنووس دەبینێ،هەروەها گرێدراوی فەلسەفە و ئایین و بیردۆزە ئیعلامییەکانە،وابەستەییەکی توندیشی بە ئازادی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندنەوە هەیە.لە ئیتیکدا ویژدانی پیشەکار دادەر و جێبەجێکارە،بە پێچەوانەی یاساکان پێویستی بە دەسەڵاتی جێبەجێکردن نییە،پێشکەوتنە بەردەوام و یەك لەدوا یەکەکانی تەکنەلۆژیای گەیاندن و پەیوەندیکردن،و بە گوندبوونی جیهان،هێندەی دیکە مەسەلەی ئەخلاقی پیشەییان گرنگ و پڕبایەختر کردووە،نەخاسمە لەگەڵ فراوانبوون و پان وپۆڕبوونی میدیای ئەلیکترۆنی و نەبوونی یاسای تایبەت بە ڕێکخستنی کاری ئەم شێوە میدیایە لە زۆربەی وڵاتاندا.

ئەگەرچی ڕەگە هزرییەکانی ئەم بابەتە بۆ سەدەیەك پێش ئیستا دەگەڕێتەوە،کەچی هێشتا سەروکاڵی میدیای ڕۆژهەڵات و وڵاتانی جیهانی سێیەم لەگەڵ ئەم بابەتە سەرەتایی و تازەیە،بەتایبەت لە هەرێمی کوردستاندا زۆربەی میدیاکاران زانیارییەکی ئەوتۆیان دەربارەی نییە،بێگومان فاکتەرەکانی ئەم حاڵەتە زۆرن،بەلاّم لەسەرووی هەموویانەوە هەژاری کتێبخانەی کوردییە لە کتێبی میدیا بەگشتی و دەربارەی ڕۆژنامەگەری کوردی بەتایبەتی،تایبەتتریش نەبوونی هیچ سەرچاوەیەکی کوردییە کە بەتایبەت باس لە ئیتیکی ڕۆژنامەگەری و بایەخ و حزوری لە میدیای کوردیدا بکات.پێموایە کەمی کتێبی زانستی دەربارەی میدیا گوناهە سەرەکییەکەی هێندەی پەیوەنداری سیاسەتی ڕژێمەکانی پێشووە کە هەردەم بەشێوازی جیاجیا هەوڵی تەسککردنەوەی ئەم بوارەی داوە لەبەردەم تاکی کوردی،هێندە ڕۆشنبیر و نووسەرانی کورد لێی بەرپرسیار نین.

بەندە بەهەستکردن بەم بۆشاییە،لە هەوڵێکدا بە سوودوەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەکی نوێی عەرەبی،خوازیارە لەڕێگەی ئەم کتێبەوە(ئیتیکی کاری ڕۆژنامەوانی) سوودێك بە میدیاکاران و فێرخوازانی بەشەکانی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن لە پەیمانگا و کۆلیژەکانی کوردستان

بگەیەنێ،بۆیە هەوڵمداوە بەزمانێکی سادە و ئاسان بابەتەکە بخەمەڕوو، و بە پشت بەستن بە بنەما ئەکادیمییەکان تیشك بخەمە سەر گرنگی پرسی ئیتیك لە کاری رۆژنامەگەری،و حزوری ئەم بابەتە لە میدیای کوردی شەن و کەو بکەم،ئەم کتێبە لەگەڵ ئەوەی ناونیشانی(ئیتیکی کاری رۆژنامەوانی)هەڵدەگرێ،وەلێ لە دەروویەکدا رۆشنایم خستۆتەسەر یاسا نێودەوڵەتییەکانی راگەیاندن و یاسای رۆژنامەگەری کوردستان،لەگەڵ تۆمارکردنی چەند رەخنە و سەرنجێك دەربارەی،چوار دەرووەکەی دیکەشم تەرخان کردووە بۆ تیشکخستنەسەر چەمك و پێناسە و سەرهەڵدان و بنەما و گرنگی ئیتیك،و جۆرەکانی پەیماننامەی شەرەفی ولاَتان و چەند دەزگایەك دەربارەی رێکخستنی کاری میدیایی، و ئیتیکی رێکلامکردن،و ئامادەگی ئەم بابەتە لە میدیای کوردی،و مەسەلەی ئازادی رادەربڕین و سیستەمەکانی راگەیاندن ،دەخوازم ئەم هەوڵەم جێی سوود بێ،چونکە بەپێی زانیارییەکانی من ئەمە یەکەم کتێبە بە زمانی کوردی بەو چڕوپڕییە باس لە ئەخلاَقیاتی کاری راگەیاندن دەکات،بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا بێ کەموکوڕی و تەواو تێر وپڕ نییە، بەو پێیەی بابەتەکە زۆر هەڵدەگرێ، و پەرەسەندنەکانی بواری میدیاش چ وەك تیۆر و چ وەك پڕاکتیك لەپەرەسەندنی بەردەوامدان.

# بەشی یەکەم

## ئازادیی رادەربڕین و سیستەمەکانی راگەیاندن

لەبەر ئەوەی پەیوەندی و وابەستەبییەکی توند لە نێوان چەمکی ئازادی بەمانا فراوانەکەی و بە تایبەت ئازادی رادەربڕین لەگەڵ ئیتیکی رۆژنامەوانی هەیە، بۆیە لەم بەشەدا سەرەتا وەك دەستپێیّکی بابەتەکەمان رۆشنایی دەخەینە سەر چەمکی ئازادی و ئازادی رادەربڕین .

چەمکی ئازادی بەدرێژایی زەمەنە مێژووییەکان پانتاییەکی فراوانی لە بیرو هزری رۆشنفیکران و نووسەران و رۆژنامەوان و شاعیرو بیرمەند و سیاسەتوانان داگیرکردووە، بەوپێیّەی کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر مرۆڤەکان هەیە،لەهەندێ قۆناخی مێژوویدا ئەو چەمکە هۆکاری راستەوخۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵگە و گردبوونەوە مرۆییەکان بووە،هاوکات فاکتەری سەرهەڵدانی جەنگ و ئاشوب و لەناوچوون و سەرلەنوێ دروستبوونی چەندین عەرش و دەسەڵات بووە،لە رۆژگاری ئێستاماندا بەردەوام ئەم زاراوەیە لەسەر زاری خەڵکی سادەو نوخبەوە گوێبیست دەبین، هەروەها خودان حزورو ئامادەگییەکی بەرفراوانیشە لە کەناڵە جیاجیاکانی راگەیاندن بەو رادەییەی هیچ دەستەواژەیەکی دیکە هێندەی چەمکە دوانییەکەی(دیموکراسی و ئازادی) چانسی بایەخدان و دووبارەبوونەوەی نیە لەو کەناڵانە. لە تەشریعاتە یاسایی و سیاسیەکانیشدا (ئازادی) ماددەیەکی سەرەکی و چەوری بابەتەکانە، هەوێنی دروستبوونی نیزامی دەستووری و پەرلەمانییە، جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤیش هەر لە منداڵدانی چەمکی ئازادییەوە سەرچاوەی گرتوەو هاتۆتە وجود.

### یەکەم : پێناسەکردنی ئازادی

چەمکی ئازادی چەمکێکی فرە رەهەند و پێناسەیە، تا ئێستا بیرمەند و زانا و فەیلەسوفەکان یەك بین و کۆك نین لەسەر پێناسەکردنی، هوکاری سەرەکی ئەو جیاوازییە بۆ جیاوازیی و دورایی نێوان فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا جیاجیاکان دەگەڕێتەوە، کە هەر یەکیەیان بە

پێی بەرژەوەندییە ئایدیۆلۆژییەکانی چەمکی ئازادی پێناسە کردووە،لە هەمان کاتدا جیاوازی پێودانگەکانی پێوانەکردنی ئازادی لە کۆمەڵگەیەك بۆ یەکێکی دیکەو ،بەریەککەوتن لە نێوان ئازادییە کەسی و گشتی و سیاسییەکان، فاکتەرێکی دیکەی دروستبوونی ئیشکالیەتی پێناسەکردنی چەمکی ئازادیین.

پرسی سەرەکی لە پێناسەکردنی چەمکی ئازادیدا وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەیە کە دەڵێت، ئازادی چییە، ئایا رەهایە یان سنووردار؟ لە راستیدا وەڵامدانەوەی ئەو پرسییارە وابەستەی دوو هەقیقەتی جیاوازە:

یەکەمیان:ئەو راستییەیە وەك ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ دەکات کە مرۆڤ بە سروشتی خۆی کائینێکی کۆمەڵایەتییە،لە ژینگەو کۆمەڵگایەك دێتە بوون و گەشەکردن لەلەیەن دەسەڵاتێکی سیاسییەوە بەڕێوە دەبردرێت کە هەندێك جار بە حکومەت، و هەندێك جاریش بە دەوڵەت ناو دەبردرێت.

دووەمیان:وەك ئاماژەمان پێدا چەمکی ئازادی چەمکێکی پڕ لە ئیشکالیەتە، دەستەواژەیەکی ناجێگیرە، مەفهومەکەی لە گۆمەڵگایەك بۆ یەکێکی دیکە بە پێی جیاوزی شوێن و کات دەگۆڕێت،هەر بۆیە بەر لەوەی پێناسەیەکی دیاریکراو و تارادەیك گشتگیر بخەینەڕوو، بەکورتی رۆشنایی دەخەینە سەر پێودانگەکانی پێوانەکردنی ئازادی لە روانگەی مەزهەبە فیکری و فەلسەفی و ئایینییەکان کە دەرهاوێشتەی هزری ئایینی و ئینسانین.

وەك ئاشکرایە مرۆڤایەتی بە چەند قۆناخێکی مێژوویی جیاوازدا گوزەری کردووە، سەرەتا مرۆڤ کائینێکی بیدائی دەوارنشین بووە، بۆ بەڕێکردنی ژیانی پشتی بەڕاوکردن بەستووە،دواتر فێری کشتوکاڵ و کشتیاری بووە و بەهۆیەوە بیری لە خاوەندارێتی و تەمەلوك کردۆتەوە، ئینجا کەوتۆتە بیرکردنەوە لە بوونەوەرو دەورووبەر، لەم قۆناخەدا هەوڵێداوە دیاردە سروشتییەکان بە شێوەیەك شرۆڤە بکات خۆشی هێنەربن، و ئازار و ناخۆشیی لێدوور بکەنەوە،لەگەڵ دابەزینی ئایینە ئاسمانییەکان هزری تەحریمکردن یان بە حەرامکردن کە بە (تاپۆ) ناودەبرێت لەدایك بووە، ئەو سەردەمانە مرۆڤ هەوڵێداوە دیاردەکانی دەرووبەروو و تەنزیمکردنی ژیانی رۆژانەی لە رێگەی ئەو عەقڵیەتەوە بەڕێوە ببات،لێرەوە لەگەڵ سەرهەڵدانی هزری تەحریم یان (تاپۆ) سەرەتاکانی دانانی کۆت و بەند لەسەر ئازادی مرۆڤ دێتە کایەوە، دواتر لەسەردەمانە مێژووییەکان هەر لەسەرهەڵدانی بت پەرستی و شارستانیەتە یەك بە دواییەکەکانی بابلییەکان

له میسۆپۆتامیا، و فرعەونییەکان، و یۆنان، و رۆمان، و شارستانیەتی فارس، و چینییە کۆنەکان، شەکل شێوازی جیاواز و جۆربەجۆری وەرگرتووە.

سەردەمانێك لە ئەوروپا هاوپەیمانیەتییەکی توند لە نێوان کەنیسە و پیاوانی حوکم و دەرەبەگ لە ئارادابوو،ئەو هاوپەیمانیەتییە تا رادەیەکی زۆر پانتایی ئازادییەکان(ئەوەی لەسەردەمانی شارستانیەتییە کۆنەکان بەتایبەت یۆنانییەکان هەبوو) تەسك کردەوە،بەڵام لەگەڵ هەرەسهێنان بەو هاوپەیمانیەتییە لەسەر دەستی رۆشنفیکر و ریفۆرمخوازان کۆتایی بە مەفهومە کلاسیکییەکەی ئازادی هات و مەفهومێکی سیاسی بۆ چەمکی ئازادی هاتە کایەوە، بیرمەندانی ئەوروپا لە روانگەیەکی سیاسییەوە کەوتنە دیفاعکردن و چەسپاندنی ئازادی،ئەو مەفهومە نوێیە،ئازادی رەهای بۆ تاکەکەس بە بنەمای بونیادنانی کارەکتەرێك دادەنا کە لە توانایدادەبێ رووبەڕووی جەبەروت و باڵادەستی دەوڵەت ببێتەوە.

لە روانگەی ئەو مەفهوم و پێودانگە فیکرییانەی دەربارەی چەمکی ئازادی خستمانە روو دەکرێ بڵێین ئازادی بریتییە لەوەی: مرۆڤ بەبێ هیچ مەرج و کۆتێك حەزی لە هەرچیەك بوو یان هەر شتێکی بە خەیاڵدا هات ئەنجامی بدات بێ ئەوەی هیچ شتێك ببێتە لەمپەر لەبەردەمی.

بێگومان ئەو تێگەیشتنە رەهایە بۆ مانای ئازادی لە زۆربەی کات و شوێنەکاندا مایەی کێشە و گرفت بوو بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، بەو پێیەی بەردەوام هۆکاری تەجاوزکردن بووە بۆ سەر ئازادی خەڵکانی دیکە ،بۆیە لێرەوە قەناعەتێك لای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دروست بوو کە ئازادی راستەقینە تەنها لە سایەی مەزهەبێکی هاوسەنگی رزگاربوو لە گشت ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دێتە کایەوە،کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە پێناو چەسپاندنی ئازادی راستەقینە و رزگاربوون لە ئازادی بێ سنوور، کەوتە بەیاسایکردنی چەمکی ئازادی،بۆیە دەستەواژەی ئازادی بەو مانایە بریتییە لە:دەسەڵاتی مرۆڤ لە دیاریکردنی هەڵسوکەوتەکانی وەك خۆی دەیەوێت بەڵام لە چوارچێوەی مەزهەبێکی هاوسەنگ کەلە توانایدابێ بژاقی کۆمەلایەتی نێوان تاك و کۆمەڵگە کۆنترۆڵ بکات،بێ زیادەڕۆیی و کەمکردن لە چوارچێوەیەکی مەعقول و دیاریکراودا،بەو پێوەرە ئازادی مانای دەستدرێژیکردنە سەر خەڵکی و شکاندنی ئادابی گشتی و تەحەکومکردن بە خەڵکی ناگەیەنێت ،بەڵکە بریتی دەبێ لە ئازادییەکی بەرپرس بەرامبەر بە کۆمەڵکە، و ئازادییەکی نە تەواو رەهاو نە کۆت وبەندکراو.

لەراستیدا ئەو پێناسەکردنە تەواو یەکانگیرە لەگەڵ بیروبۆچوونی زانایانی سیاسەت و کۆمەڵگە و میدیا کە دەمێکە داوای کۆت وبەندکردنی ئازادی رەها دەکەن، بەو پێیەی هۆکاری

دەستدرێژیکردنە سەر مافی خەڵکی دیکەیە،بۆیە ئەو زانایانە لە پێناو لەقالبدانی ئازادی رەها ئەومەبدەئەیان داهێنا کە دەڵێت:ئازادی تۆ لەو خاڵەوە دەستپێدەکات کە ئازادی خەڵکانی دیکەی تێدا دەوەستێت، دەنا بە پێچەوانەوە ئازادی دەبێتە مایەی فەوزاو پەشێوی نانەوە.

وجودی مرۆڤ بەندە بە رادەی ئازادی ئەو مرۆڤەوە،بۆیە ئازادنەبوونی واتای لەدەستدانی ئینسانیەت و بەها و کەرامەتی ئەو مرۆڤە دەگەیەنێت و دایدەبەزێنێتە ریزی ئاژەڵان،هەر لەبەر ئەوەشە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بایەخێکی رادەبەدەر بەو پرسە دەدرێت بەتایبەتی مەسەلەی ئازادییە سیاسییەکان کە لە ئەدەبیاتی هزری لیبڕاڵدا وەك دوانەی دیموکراسی دادەندرێت،کە مانای ئازادبوونی ویستی مرۆڤەکان دەگەیەنێت لە دەسنیشانکردنی جۆری حوکمڕانی و حوکمڕانانەدا،بەواتایەکی دیکە ئازادی سیاسی بریتییە لە بەشداریکردنی خۆویستانەی مرۆڤ لە پرۆسەی دەنگدان و خۆکاندیدکرن و بەڕێوەبردنی پۆستە گشتییەکاندا.

ئازادی رادەربڕین

ئازادی رادەربڕین ئەو ئازادییەیە کە رێگە بە تاك نادات بە ئارەزوو و ئەهوائی خۆی ،بێ هیچ رێگری و سانسۆرێك تەعبیر لەخۆی بکات، بێگومان ئەمەش لە چوارچێوەی حکومەت یان دەسەلاتێکی حکومڕانیدا دێتە دی کە جیاوازی لە نێوان هزر و روانبینینی تاك و حکومەتدا بکات.

پێشکەوتنەکانی بواری میدیا لە نیو سەدەی رابردوودا کاردانەوەیەکی راستەوخۆی لەسەر مەسەلەی ئازادییەکان بەگشتی و پرسی ئازادی رادەربڕین بەتایبەتی هەبووە،بۆیە هەر کات باس لە ئازادی رادەربڕین بکرێت ناکرێت رۆڵ و کاریگەری میدیا پشتگوێ بخرێت، چونکە میدیا فاکتەری سەرەکی بە جیهانیکردنی مەسەلەی ئازادی رادەربڕن بووە،هەنوکە ئەو پرسە جێگەی بایەخ و گرنگی دەوڵەتان و **UN**رێکخراوە نێونەتەوەییە ناحکومیەکانیشە،هەروەها پانتاییەکی فراوانیش لە دەستووری وڵاتان داگیردەکات کە هەر هەموویان لە تەشریعکردنی ئازادی میدیا و رادەربڕیندا پشت بە جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨ دەبەستن .

## دووەم: ئازادی و سیستەمەکانی راگەیاندن

١/ئازادی لە فیکری سیاسی لیبڕاڵدا

ئەو پێودانگە دەرهاوێشتەی هزری فەلسەفی رۆشنفکرانی ئەوروپایە کە زەمەنێکی دوورو درێژ بەرەنگاری هاوپەیمانیەتییە دوو قۆڵییەکەی کەنیسە و دەرەبەگایەتی سیاسیان

دەکرد، لە روانگەی (جۆن سیتوارت میل)کە بە گەورە رۆشنفکر و دارێژەری هزری سیاسی لیبڕاڵ دادەندرێت پێودانگی بنەڕتی ئازادی لە بنەمای(زیان نەگەیاندن بە خەڵکی دیکە) سەر چاوە دەگرێت، (میل) دەڵێت:"تۆ تا ئەو ئاستە ئازادی کە زیان بە خەڵکی دیکە نەگەیەنی"

لە کاتی خۆیدا هزر و پێودانگەکانی (میل) رووبەڕووی چەندین رەخنە و تۆمەت بوونەوە، بەلاّم سەرباری هەموو ئەمانە تا ئەمڕۆشی لەگەڵ بیّ فوقەها و بیرمەندانی یاسا بۆچوونەکانی (میل) وەك سەرچاوەو بنەما سەیردەکەن، و دارێژەرانی هاوچەرخی یاسا ئەو بۆچوونانە وەك پێودانگی سەرەکی لە دیاریکردنی مەسەلە یاساییە پەیوەستەکان بە تاوان و حەلاڵ تەماشا دەکەن.

تایبەتمەندییەکانی رۆژنامەگەری لە سیستەمی لیبڕاڵدا

١/موڵکداری تاکەکان بۆ هۆکانی راگەیاندن،واتە جگە لە دەسەلاّت هەموو تاکێك مافی دامەزراندن و موڵکداریکردنی دەزگا جیاجیاکانی رۆژنامەوانی هەبێ.

٢/دامەزراندنی رۆژنامە بێ وەرگرتنی مۆڵەت.

٣/پێش دەرچوونی رۆژنامەك نابێ مەرجی تەئمینی دارایی لەسەر بسەپێندرێ.

٤/هاولاّتی مافی مومارەسەکردنی کاری رۆژنامەوانی هەبێ بەبێ هیچ مەرجێك.

٥/دادگاکان تاکە لایەنی رێگە پێدراون بەسەپاندنی سزا بەسەر رۆژنامەگەری.

٦/هیچ دەسەلاّتێکی کۆمەڵگە بە دەسەلاّتی دادوەریشەوە مافی هەڵوەشاندنەوەی هیچ رۆژنامەو گۆڤارێکی نیە.

٧/نابێ هیچ سانسۆرێك لەسەر رۆژنامەکان دابندرێت.

٨/رۆژنامەگەری ئازادە لە رەخنەگرتن لە سەرۆکی دەوڵەت .

٩/رۆژنامەگەری ئازادە لە رەخنەگرتن لە نیزامی حوکومڕانی.

## ٢/ئازادی لە فیکری سیاسی مارکسیدا

فیکری مارکسی وەك پەرچەکردار و بەرپەرچدانەوەی فیکری لیبڕاڵ هاتە لەدایك بوون،فەلسەفەی مارکسیەت لەو بنەچە فیکرییەوە سەرچاوە دەگریّ کە دەسەلاّت بە دوژمنی ئازادییەکان دادەنێت،بۆیە پێی وایە چەمکی ئازادی بە واتا نموونەییەکەی ئەو کاتە بەرجەستە دەبیّ و دەبێتە واقیع کە کۆمەڵگە دەگاتە قۆناخی شیوعیەت و دیاردەی دەسەلاّتدارێتی تەواو بزر دەبێ، بە واتایەکی دیکە پێودانگی سەرەکی ئازادی لە هزری مارکسیەتدا بریتییە لە نەمان و لە ناوچوونی دەسەلاّت.

## تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەگەری لە سیستەمی سۆسیالیزمدا

١/کەرتی تایبەت و تاکەکان بۆیان نیە خاوەنداریێتی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان بکەن.

٢/پێویستە میدیا لە ئاست خواست و حەزەکانی وەرگردابێت.

٣/ڕاگەیاندن لە ڕێگەی بلاْوکردنەوەی هزری سۆسیالیزم و پەروەردەی ئیشتیراکیدا خزمەتی تاك و کۆمەڵ دەکات.

٤/پێویستە میدیا هەردەم لە خزمەتی چینی چەوساوە دابێت.

٥/دەبێ ئامانج و وەزیفەکانی ڕاگەیاندن هاوتا و گونجاوبن لەگەڵ ئامانجەکانی کۆمەڵگە.

٦/میدیا بۆی هەیە سەرجەم ڕووداوە جیهانی و هەرێمایەتییەکان ڕوماڵ بکا و بەدواداچوونیشیان بۆ بکات.

٧/کۆمەڵگە مافی یاسایی هەیە بۆ سزادانی ڕۆژنامەگەری نابەرپرس و تاوانکار بەرامبەر ئاسایشی نەتەوەیی و بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵ لە ڕێگەی دادگاکانەوە.

### ٣/ئازادی لە ئایینی ئیسلامدا

تێکستەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر محەمەد(د.خ) خیتابی سەرەکی ئایینی ئیسلامن،شرۆڤەکردنی خیتابی ئایینی دەمانگەیەنێتە ئەو ڕاستییەی کە نە لە ئایەتە قورئانییەکان و نە لە سونەتەکانی پێغەمبەردا هیچ ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ دەستەواژەی ئازادی نەکراوە، تەنها بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نەبێ لە دوو ئایەتدا، کاتێك پەروەردگار دەفەرموێت((کل امرئ بما کسب رهین)) هەروەها ((وأن لیس للإنسان إلا ما سعی)).

ئەگەرچی فیکری ئایینی بەشێوەکی ڕاستەوخۆ و حەرفی باسی لە ئازادی نەکردووە، وەلێ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هێمای بۆ ئەو پرسە کردووە،تێڕوانینی ئیسلام بۆ مەسەلەی ئازادییەکان لەو دیدگا هزرییەوە سەرچاوە دەگرێ، کە لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان بە ئازادی لە دایك دەبن بۆیە دەبێ خودان ئازادی ڕەها بن،بەلاّم ئەو ڕەهاییە تا ئەو ئاقارە سنوور دەکێشێ کە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵدا بەر بە ڕاستی و چاکە نەکەوێ و ناکۆك نەبێ لەگەڵیان،ئەگەر ئەمە ڕوویدا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی پرسی ئازادی لەبەردەم چەمکی ڕاستی و چاکەدا بەرەو پووکانەوە دەچێ.

فیکری ئیسلامی فیکرێکی ئاسمانی میانڕەوە،بە بەراوردکردن لەگەڵ هزرە ئینسانییەکانی وەك لیبراڵ و مارکسییەت دێرین و کۆنە، تەمەنی بۆ ١٥٠٠ ساڵ دەگەڕێتەوە لە کاتێکدا تەمەنی هیچ کام لەو فیکرانە لە ٣٠٠ ساڵ تێپەڕ ناکات، زهنیەتی تەحریم لە ئیسلامدا زهنیەتێکی قۆناخدارە، سەرەتا هەموو شتەکان بەرەهایی رێپێدارو بوونە، دواتر بە شێوەیەکی قۆناخدار سنووردار و تەسککراونەتەوە.

٤/ئازادی لە سیستەمی دیکتاتۆریدا

سیستەمی دیکتاتۆریەت سیستەمێکی حوکمڕانی تاکڕەوە، سەرجەم جومگە هەستیارەکانی دەسەلاّت بۆ تاکەکەسێك پاوان دەکات،لە سایەی ئەو سیستەمەدا هیچ پانتاییەك بۆ ئازادییەکان نابیندرێت،شتێکی حەتمیشە نەبوونی ئازادی رەنگدانەوەی راستەوخۆی لەسەر میدیا دەبێ و نێگەتیڤانە بەسەر ئەرك و وەزیفەی میدیادا دەشکێتەوە.

دەکرێ تایبەتمەندییەکانی میدیا لە سیستەمی دیکتاتۆریدا لەمانەی خوارەوە کۆبکەینەوە:

١/رۆژنامەگەری تەواو گوێڕایەڵ و ژێر دەستی دەسەلاّتە.

٢/رۆژنامەنووس و میدیا سەربەخۆنین.

٣/نابێ رۆژنامەنووس گرفت بۆ دەسەلاّت دروست بکا ،و ئەو جۆرە رەخنانەی لێبگرێ کە دەبنە مایەی لاوازبوونی.

٤/پێویستە رۆژنامەوانی خۆی لە ئیهانە و رەخنەگرتن لە بەها گشتییەکان و دەسەلاّتداران بەدووربگرێ.

٥/دەسەلاّت بەئارەزووی خۆی سانسۆر دەسەپێنێ.

٥/ئازادی لە سیستەمی سیاسی ولاّتانی تازە پێگەیشتوودا:

زاراوەی ولاّتانی تازەپێگەیشتوو دوای جەنگی جیهانی سێهەم نەتەوە یەکگرتووەکان بە بالاّی ئەو ولاّتانەی دابڕی کە تازە سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندبوو و لەژێر دەسەلاّتی کۆلۆنیالیزمدا رزگارییان بوبوو.

سیستەمی سیاسی و میدیایی ئەو جۆرە دەسەلاّتانە تەواو پێچەوانەی سیستەمی رۆژئاوا و ولاّتانی کۆلۆنیالە، لایەنگرانی ئەو سیستەمە پێیان وایە ولاّتانی جیهانی سێهەم لەرووی قۆناخی مێژووییەوە تایبەتمەندی خۆیان هەیە و ناکرێ لەمەسەلەکانی ئازادی رادەربڕین و رۆژنامەگەری و حوکمڕانیدا لاسایی ولاّتانی لیبراڵ بکەنەوە، بۆیە لە دیدگەی ئەواندا دەبێ میدیا و بواری رۆشنبیری لە خزمەتی پرسە نەتەوەیی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی و کلتووریەکان دابێ.

تایبەتمەندییەکانی میدیا لە ولأتانی تازە پێگەیشتوودا:

١/بەکارهێنانی میدیا لە پێناو پاراستنی ناسنامەی نەتەوەیی و کلتووریدا.

٢/پێویستە یارمەتی میدیا بدرێت بۆ گەیشتن بە گەشە و پەرەسەندن.

٣/گرنگیدان بە زمان و کلتووری نەتەوەیی و ئەولەویەتدان بە بلأوکردنەوەی هەواڵی ولأتانی تازەپێگەیشتوو.

٤/کۆنترۆڵکردنی میدیا لە لایەن دەوڵەتەوە.

٥/رەچاوکردنی ئازادی و بەرپرسییاریەتی بۆ گەیشتن بە پەرەسەندنی تەواو .

٦/سیستەمی بەرپرسییاریەتی کۆمەڵایەتی

ئەم سیستەمە کاردانەوەبوو بەرامبەر سیستەمی ئازادی رەها ،لەو سیستەمەدا هاوسەنگی لە نێوان سەربەخۆیی میدیا و بەرپرسیارییەتیەکانی بەرامبەر کۆمەڵگە رەچاو کراوە، ئازادی و بەرپرسیارییەتی وەك دوو رووی یەك دراو وان.

دەکرێ تایبەتمەندییەکانی رۆژنامەوانی لە سیستەمی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵایەتی لەمانەی خارەوەدا کۆبکەینەوە :

١/پێویستە رۆژنامەگەری بەکردە هەندێك بەرپرسیارییەتی لەئەستۆ بگرێت لەوانە" وردبینی و مەوزوعیت لە کۆکردنەوەی زانیاری و گەیاندنیان وەك خۆی بە وەرگر.

٢/دەبێ رۆژنامەنووس لەئاست خواست و داواکارییەکانی وەرگرانی بێ و پێداویستییە مەعریفی و تەرفیهییەکانیان بەدیبێنێ.

٣/رۆژنامەگەری بەرامبەر دەزگا رۆژنامەوانییەکان و کۆمەڵگە بەرپرسیارییەتی لەسەرشانە.

٤/نابێ رۆژنامەگەری بە شێوازێکی نادروست تاوتوێی ئەو پرسانە بکات کە دەچنە خانەی ئاسایشی نەتەوەییەوە.

٥/بەسیستماك کردنی بەرپرسیارییەتیەکانی رۆژنامەنووس لە چوارچێوەی یاسادا.

٧/سیستەمی بەرپرسیارییەتی نێودەوڵەتی راگەیاندن

خاوەنی ئەم سیستەمە زانای ناوداری عەرەبی دکتۆر (موختار ئەلتوهامی)یە کە ساڵی ١٩٥٨ ز رەشنووسی پرۆژە یاسای نێودەوڵەتی راگەیاندنی خستە بەردەم رای گشتی و نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەم سیستەمە جەخت لەسەر بەرپرسیارییەتی رۆژنامەوانان دەکات لە ئاستی نێونەتەوەییدا لە کاتی رومالکردنی رووداو و هەواڵە نێوخۆیی و دەرەکییەکاندا، بنەچەی ئەو

سیستەمە بریتییە لەوەی کە دونیا گۆڕەپانێکی مەزنی شەڕ و ململانێی نێوان هێزە نەیار و دژ بەیەکەکانە، لەم نێوەندەدا ئەرکی رۆژنامەنووس ئەوەیە بەرپرسییارانە مامەڵە لەگەڵ رووداوەکان بکات، و تەنها لاگیری ئازادی و دیموکراسی راستەقینەبێ.

تایبەتمەندییەکانی سیستەمی بەرپرسیارییەتی راگەیاندن:

١/پابەندبوونی دەسەڵاتدارانی سیاسی بەو رێکەوتننامانەی کە حکومەتەکان مولزەم دەکات بە دابینکردنی ئازادی رۆژنامەوانی.

٢/پابەندبوونی میدیاکاران بە بەڵێننامە نێونەتەوەییەکانی شەرەفی رۆژنامەگەری .

٨/سیستەمی هاوبەشی دیموکراسی

ئەم سیستەمە تێکەڵەیەکە لە سیستەمی لیبڕالیزم و سۆسیالیزم و یەکسانخوازی،دژی پاوانکردنی موڵکداری دەزگا رۆژنامەوانییەکانە لە لایەن کەس یان نێوەند یان هێزێکی دیاریکراودا، هەروەها دژی دەستێوەردانی حکومەت و نێوەندە بازرگانی و داراییەکانە لە کاروباری میدیادا،جەخت لەسەر هاوبەشی و ئازادی و بەرپرسییاریەتی دەکات لە کاری میدیایدا.

**تایبەتمەندییەکانی رۆژنامەوانی لە سیستەمی هاوبەشی دیموکراسیدا:**

١/دژایەتیکردنی پاوانکاری لە موڵکداریکردنی میدیادا.

٢/رێگەنەدان بە دەستێوەردانی حکومەت و بازرگان و پیاوانی کار لە ئیش و کاری میدیادا.

٣/جەختکردن لەسەر ئازادی و یەکسانخوازی.

٤/هاندانی هاریکاری و کاری هاوبەش لەنێوان دەزگا رۆژنامەوانییەکان.

کەواتە دوای ئەو پۆلێنکاری و دابەشکردنە،و بە پشتبەستن بە بیردۆزەکانی ئازادی و ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکانی سیستەمی سیاسی،دەکرێ سیستەمەکانی راگەیاندن کە پەیوەندی راستەوخۆیان بە بابەتی ئیتیکی میدیاوە هەیە بەم شێوەیە ژمارەبەند بکەین:

١/سیستەمی ئازادی(لیبڕاڵ)

٢/سیستەمی بەرپرسییاریەتی کۆمەلاّیەتی

٣/سیستەمی سۆسیالیستی

٤/سیستەمی ئیسلامی

٥/سیستەمی دیکتاتۆری
٦/سیستەمی ولاَتانی تازە پێگەیشتوو
٧/سیستەمی بەرپرسیارییەتی نێودەوڵەتی میدیا
٨/سیستەمی هاوبەشی دیموکراسی

سەبارەت بە ئیتیکی رۆژنامەوانیش، بیرمەندو پسپۆڕانی واری میدیا ئەم بابەتە بە بابەتێکی فرەلایەن و هەمەجۆر وەسفدەکەن،بەو پێیەی وابەستەگیری چەند بابەتێکی دیکەی وەك یاسا و فەلسەفە و ئازادییەکانە، هەندێك لە زانایان چەند تێۆرێکی فەلسەفی بواری ئەخلاقیان دەسنیشان کردووە کە رەنگدانەوەیان لەسەر پرسی ئیتیکی رۆژنامەوانی هەیە، ئەوانیش بریتین لە:

١/تیۆری ئەرکە ئەدەبیەکان ٢/تیۆری دەرئەنجام یان خۆویستی(تیلۆلۆژی) ٣/تیۆری بزوێنەر(هاندەر) ٤/تیۆری ئەخلاقی رێژەیی ٥/تیۆری هەلۆێست ٦/تیۆری پیشکەوتنی ئەخلاق ٧/تیۆری هەبوون.

هەر ئەو زانا و بیرمەندانە پێیان وایە مەسەلەی ئیتیك لە کاری رۆژنامەگەریدا کارلێك و پەیوەندی توندی بە سیستەمەکانی راگەیاندنەوەش هەیە، بۆیە لێرەدا بە درێژی تیشك دەخەینە سەر دوو لەو بیردۆزانەی کە پێشتر باسمان کردن بەهۆی ئەوەی لە هەناوی ئەواندا هێڵە گشتییەکانی ئیتیکی رۆژنامەوانی دیاریکراوە.

١/:بیردۆزی ئازادی

مێژووی لەدایك بوونی ئەو بیردۆزە بۆ کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم و سەرەتای سەدەی هەژدەهەم دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەی نوخبەی رۆشنبیری لە ئەوروپا کە رۆشنفیکرو بیرمەندو فەیلەسوفەکانی لەخۆدەگرت، ئالاَی بەرەنگاربوونەوەی دژ بە دەرەبەگایەتی و پیاوانی کلێسە بەرزکردەوە،و بە شێوەیەکی ئاشکرا داوای روخانی سسستەمی دەرەبەگایەتی و ئازادبوونی مرۆڤیان کرد.

سەردەمانێکی دوور و درێژ دەسەڵاتە هاوبەشەکەی کلێسەو دەرەبەگ حوکومڕانی ئەوروپایان دەکرد،لەو سەردەمەدا شتێك نەبوو ناوی ئازادی بێت،ئازادی تەنها بۆ ئەو نوخبە دیاریکراوەی دەسەڵات بوو کە چەند بەرژەوەندییەکی هاوبەش کۆیکردبوونەوەو میللەتانی ئەوروپایان شێوەی مێگەل بەڕێوەدەبرد،زاتی مرۆڤ و ویستەکانی دوو لەو شتە پشتگوێخراوانەبوون کە لە قامووسی سیاسی ئەوکاتی دەسەلاَتدارانی ئەوروپا بوونیان

نەبوو،ئەورووپییەکان دەمێك بوو لەو ستەمە حوکمڕانییە و سلوکی کلێسا، بێزار و بێئومێد بوبوون،بۆیە کاتێك بیرمەندو رۆشنفیکران شۆڕشیان دژ بە دەرەبەگ و پیاوانی ئایینی راگەیاند زۆرینەی خەڵکیان لەگەڵ بوو،ئەوەی کاری رۆشنفیکرو ریفۆرمخوازانی ئاسانترکرد ئەو شۆڕشە چاپەمەنییە بوو کە لە ئەوروپا سەریهەڵدا و خزمەتێکی بێڕادەی پێشکەش بە شۆڕش کرد، بەو رادەیەی بەشێکی زۆر لە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە گەر شۆڕشەکەی بواری چاپەمەنی نەبووایە مەحاڵبوو شۆڕشی ئەوروپا لەپێناو ئازادی سەرکەوتووبێ.سەرکەوتنی شۆڕش کۆتایی بە حوکمی سەدان ساڵەی دەرەبەگ و پیاوانی کلێسا هێنا و بنەچەکانی بیردۆزی ئازادی داچەقاند، کە هزری لیبراڵی ئازادی بە دوای خۆیدا هێنا.

## بنەما گشتییەکانی بیردۆزی ئازادی

بیردۆزی ئازادی شێرگیرانە جەخت لەسەر پیرۆزی ئازادی رادەربڕین و رۆژنامەگەری و ئازادی عەقیدە و پەرستن دەکات،دەکرێ بنەما گشتییەکانی لەم خاڵانە کۆبکەینەوە:

١/مافێکی سروشتی مرۆڤە بەدوای راستیەکان بگەڕێت و هەوڵی تێگەیشتنیان بدات لە هەر کات و شوێنێك بێ.

٢/کەرەستەی سەرەکی گەیشتن بە راستی، گەنگەشە و ئاڵوگۆڕی بیروڕاکانە،پێویستە مرۆڤ جیاوازی بیروڕا بە شتێکی زۆر سادە و ئاسا وەربگرێت و قەبووڵی بکات.

٣/بیروبۆچوونەکان هەرچەندە ناکۆك و لێکدووربن پێویستە رێگەی دەربڕین و ئیقناعکردنی خەڵکیان پێبدرێت ،چونکە لە کۆتاییدا سەرکەوتن هەر بۆ بۆچوونە راست و گونجاوەکانە.

٤/زانین و زانیاری وەرگرتن هاوشێوەی ئاو و هەوا مافێکی سروشتی مرۆڤە، بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێ مومارەسەی ئەو مافە بکات پێویستە وەسیلەی سەرەکی وەدەستهێنانی زانیارییەکان کە رۆژنامەگەرییە، ئازاد و سەربەخۆ بێت .

٥/مافی وەرگرتنی زانیاری ئەوەیە مرۆڤ ئەو زانیارییانە وەدەست بێنێ کە حەزیان لێدەکات نەك زانیاری نەویست و نەخوازراوی بەسەردابسەپێندرێ.

## ئەو رەخنانەی ئاڕاستەی بیردۆزی ئازادی دەکرێن

بیرمەند و پسپۆرانی میدیا پێیان وایە بیردۆزی ئازادی لە ئەرزی واقیعدا و لە سایەی سستەمی سەرمایەداریدا هیچ بوون و مانایەکی نیە چونکە دەمێکە کۆمپانیا و نێوەندە

سەرمایەدارییەکان ئەو بیردۆزەیان لە مانا و بنەماکانی بەتاڵکردووە،هەنوکە ئەوەی ماوەتەوە تەنها سەرابی بیردۆزەکەیە لە دوو توێی کتێبەکانی میدیا و فەلسەفەدا،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پسپۆران کۆمەڵێك رەخنە ئاڕاستەی بیردۆزی ئازادی دەکەن،لەسەرووی هەموویانەوە رەخنەکانی زانای بەناوبانگ(تێۆدۆر بیتەرسۆن)، بیتەرسۆن لە رەخنەکانیدا بە گشتی تەرکیز لەسەر وەزیفەی دەزگاکانی راگەیاندن دەکات،دەکرێ رەخنەکانی نێوبراو لەمانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

١/دەزگاکانی راگەیاندن قۆرخی هێزی راگەیاندن دەکەن لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە تایبەتییەکانیان، و بە شێوەیەکی رەهاش لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە بانگەشە بۆ راو بۆچوونەکانیان دەکەن لە بوارەکانی سیاسەت و کۆمەڵگە و ئابووری.

٢/لە رێگەی سیاسەتە رۆژنامەوانییەکەیەوە خزمەتی سستەمی سەرمایەداری دەکات.

٣/بەرەنگاری هەموو هەوڵێکی گۆڕانخوازانە دەبێتەوە.

٤/لەکاتی رووماڵکردنی رووداوەکاندا بایەخێکی زۆر بە بابەتە لاوەکیەکان دەداو پرسە هەنوکەیی و هەستیارەکان پشتگوێ دەخات.

٥/ئادابی گشتی رووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە.

٦/چینێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری دیارکراو کە ئەوانیش سەرمایەدارو خاوەن کۆمپانیاکانن تەحەکوم بە میدیا دەکەن،بۆ خەڵکی دیکە زەحمەت دەبی خۆی لەو بوارە بدات، ئەمەش دەرئەنجام بە مەترسی لەسەر بازاڕی فیکری سەربەخۆ و ئازادییەکاندا دەشکێتەوە.

بەکورتی بواری رۆژنامەگەری لە سایەی بیردۆزی ئازادیدا خاوەن ئازادییەکی رەهایە،هیچ کۆت وبەند و سانسۆرێکی بەسەرەوە نیە،ئەو رەهاییە لە راگەیاندندا مایەی مەترسی و رەخنەی پسپۆر و بیرمەندانی میدیایە،هەر ئەمەش پاڵی بە بەشێکیانەوە نا بیر لە داهێنانی بیردۆزێکی دیکە بکەنەوە کەموکوڕی و خاڵە لاوازەکانی ئەو بیردۆزە چارەسەر بکات،بەو پێیەی کاری میدیا لە سایەی بیردۆزی ئازادی رەهادا فەوزای کۆمەڵایەتی و پاشەگەردانی لێدەکەوێتەوە.

٢/بیردۆزی بەر پرسیارییەتی کۆمەڵایەتی

ئەم بیردۆزە وەك كاردانەوەيك بەرامبەر بەکارهێنانی ئازادی رەها لە هۆکانی راگەیاندن هاتە کایەوە، کە ئیعتیباری بۆ هیچ بەها و رێسایەك نەدەکرد، هەروەها خۆی لە هەموو

بەرپرسیارییەتێکی کۆمەلاّیەتی و ئەخلاقی قوتارکردبوو،بیردۆزی بەرپرسیارییەتی کۆمەلاّیەتی بەپێچەوانەی بیردۆزی پێشوو جەخت لەسەر هاوسەنگیکردن لە نێوان ئازادی رادەربڕین و بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە دەکاتەوەو کار بۆ هێنانەدی ئەو هاوسەنگییە دەکات،بەپێی بنەماکانی ئەو بیردۆزە میدیا خودان وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتییە و بەدەر نیە لە بەرپرسیارییەتی،باسکردن لەمەبدەئی بەرپرسیارییەتی راگەیاندن مەبدەئێکی دیکەی سەبارەت پیشەی راگەیاندن بەدوای خۆیدا هێنا ئەویش زەرورەتی پابەندبوونی خودیی میدیایە بە کۆمەڵە پەیماننامەیەك کە بەهۆیەوە هەوڵی هێنانەدی هاوسەنگی لە نێوان ئازادی کەسی و رادەربڕین و بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە دەدات،هەر لێرەوەش پرسی ئیتیك لە پیشەی میدیادا هاتە کایەوە کە کۆڵەگەکانی بریتین لە ئازادی و بەرپرسیارییەتی، و هێنانەدی هاوسەنگیش لە نێوانیاندا کرۆکی ئیتیك و کاری راگەیاندنە.

## بەشی دووەم

## ئیتیکی ڕۆژنامەوانی(چەمك و سەرهەڵدان)

### یەکەم: چەمك و پێناسە

بەر لە ناساندنی چەمکی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی پێویستە لەسەر چەند دەستەواژەیەك بوەستین کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە ئیتیکی ڕاگەیاندنەوە هەیە ئەوانیش:

ئیتیك : ئەم وشەیە لەبنەڕەتدا وشەیەکی لاتینییە، لە وشەی (**Ethic**) یونانییەوە هاتووە، لە زمانی فەرەنسیدا بە (**Le Dentologie**) دەخوێندرێتەوە کە هاوتای ئیتیکی پیشەییە و لە دوو بەش پێکدێت (**Deontos**)، کە مانای پێویستی ئەنجامدانی کارێك دەگەیەنیت لەگەڵ وشەی (**Logos**) کە واتای زانست دەگەیەنێت،بەڵام فەرەنسییەکان دوای لێکدانی هەردوو وشەکە،و سەرباری گوزارشتنەکردنی لە مانای ئەخلاق،بۆ دەلالەتکردن لە مانای ئیتیکی پیشەیەکی دیاریکراو بەکاریان هێناوە.

لە فەرهەنگە ئینگلیزیەکاندا ئیتیك(**Ethic**) بە ڕەوشت و کردار و گوفتاری باش گوتراوە،بۆ زانستی ئیتیکیش وشەی(**Ethics** )یان بەکارهێناوە کە بەگشتی لە بابەت و بنەما و پێوەرە ئەخلاقییەکان دەکۆڵێتەوە،سەردەمانێکیش گریکەکان ئەو وشەیان بۆ کرداری ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنی بەرهەم و تێکستە ئەدەبی و هونەری و زانستییەکانی نووسەران بەکاردەهێنا.

کەواتە لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوادا ئیتیك زاراوەیەکە واتای ڕەوشت یان ئاکار یان ئەخڵاق دەگەیەنێت، و پێوەرێکە بۆ جیاکردنەوەی کردارو گوفتار و هەڵسوکەوتی باش و دروست لە کردار و هەڵسوکەوتی خراپ.

لە زمانی عەرەبیشدا وشەی ئەخڵاق لە وشەی(خلق)ەوە هاتووە و کۆیەکەی (أخلاق)ە،و دەلالەت لە چەند مانایەکی جیاواز دەکات وەك"چاکە و پیاوەتی و خووی باش و هەموو هەڵسوکەتێکی چاك کە لە کەسایەتی مرۆڤدا بە فیترە هەبن. ئەم زاراوەیە لە زۆرینەی فەرهەنگە عەرەبی و کتێبە فەلسەفی و ئایینییەکان ناوی هاتووە، لە قورئانی پیرۆزدا

پەروەردگار دەفەرموێت: ((و إنك لعلى خلق عقيم)) هەروەها دەفەرموێت:((إن هژا الا خلق الاولين)).

پسپۆر و زانایان بە وشە و دەستەواژەی جیاواز چەمکی ئیتیکیان پێناسەکردووە، بەڵام سەرئەنجام هەموویان یەك ماناو دەلالەت دەبەخشن ،نوێترین پێناسەی ئیتیك ئەو ناساندنەیە کە دەڵێت:

ئیتیك: شێوەیەکە لە شێوەکانی تێگەیشتن و پەیپێبردنی مرۆڤ کە پشت بە رێکخستن و جێگیرکردنی هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەبەستێت لە سەرجەم بوارە کۆمەلأیەتیەکانی ژیاندا،هەر لە نێوەندی ماڵ و خێزانەوە تا دەگاتە هەڵسوکەوتی رۆژانە لە شوێنی کارکردن و شەقام و شوێنە گشتییەکاندا.یان بریتییە لە جێبەجێکردنی پراکتیکییانەی مانا و بنەماکانی زانستی ئەخلاق کە سەرجەمیان جەخت لەسەر کردار و گوفتاری باش دەکەن.

زانای بەناوبانگیش (ئاندرا لاند) لە کتێبە بەناوبانگەکەی(فەرهەنگی هونەری و رەخنەگرانەی فەلسەفی) دەربارەی ئیتیك دەڵێت:"کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی دیاریکراو و پەسەند کراوە،لە قۆناغ و کۆمەڵگەیەکی تایبەت و دیاریکراودا،کە تاکەکان هەوڵی خۆگونجاندنی لەگەڵ دەدەن".

پرۆفیسۆر(بەسام ئەلمەشاقیبە)ش دەڵێت:"ئیتیك بریتییە لە هەڵەسەنگاندن و دیراسەتکردنی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ لە ژینگە و زەمەنێکی دیاریکراودا، لەرێگەی ئەو پێوەر و بنەما ئەخلاقیانەی کە لە بنەڕەتدا مرۆڤ خۆی بۆخوی دیاریکردوون".

(شوان ئادەم)یش بەم وشانە پێناسەی دەکات:"ئیتیك هەبوونی توانای جیاکاریکردنی مرۆڤە لەنێوان هێزی چاکەو خراپە، یاخود توانستی پەیپێبردنیەتی لە ناسینەوەی راستی و هەڵەی ژیاندا،بۆیە زیاتر ئامانجەکانی کردەکیین، چونکە ئیتیك لەو لقە مەعریفییانەیە کە بایەخ بە بەرژەوەندی گشتی دەدات و لەناو کۆمەڵگەدا هەوڵی دانانی رێساگەلێك بۆ رەفتاری مرۆڤەکان دەدات".

فەلسەفە : لەسەرجەم بابەت و رووداو دیاردە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندار بە جیهان و کۆمەڵگە دەکۆڵێتەوە، مەسەلەی هزری و دونیای هەبووش دەخاتە بەر باس و تاوتوێکردن.

بەهاکان : زاراوەی (بەها) لە زمانی ئینکلیزیدا(**Valeur**) سیفەتێکە بۆ مرۆڤی ئازا لە جەنگدا بەکاردێت، رەچەڵەکی وشەکە لە بنەڕەتدا لاتینییە لە وشەی(**Valovre,Valor**) داتاشراوە، بەشێوەیەکی گشتی لە ئەدەبیات و فەرهەنگی کۆمەلأیەتی و یاسایدا بە کۆ(بەهاکان) بەکارهاتووەو بریتیە لە: هاوتایی و یەکسانی راستەقینەی شتێك بەرامبەر

شتێکی دیکه، بەو پێوەرەی کە بازاڕ یان ڕێسا کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە دیاریدەکات، بۆیە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە نرخی کەلوپەل لە بازاڕکان و ڕێسا و ئاکارە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە و دیارییان دەکات.

مۆراڵ: ئەم زاراوەیەش زۆرجار لەبری ئەخلاق بەکاردێت و لە وشەی(**Mores**) لاتینییەوە وەرگیراوە و بریتییە لە: کۆمەڵێك پێوەری پەسندکراوی گشتی لە کۆمەڵێکی مێژوویی دیاریکراودا.

ئاداب: لە فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کۆندا جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان زاراوەی ئاداب و ئەخلاقدا نیە، لە ئەدەبیاتی نوێشدا زۆرجار وشەی ئاداب لە هەندێ شێوە دیالێکت و داڕشتندا وەك جێگرەوەو موورادیفی وشەی ئەخلاق بەکاردێت، ئاداب لە بواری کۆمەڵایەتیدا بۆ وەسفکردن و دەسنیشانکردنی گوفتار و کردارەکانی مرۆڤ بەکاردێت، جا ئەو هەڵسوکەوتانە باش بن یان خراپ.

ئیتیکی پیشەیی:بریتییە لە کۆمەڵێك بنەما و ڕێسای دانراو لە هەر پیشەیەکدا کە تاك و گروپی ئەندامانی ئەو پیشەیە پێویستە لە کاتی ڕاییکردنی پیشەکەیاندا ڕەچاوی بکەن و لێی لانەدەن، ئەم ڕێسا و پێوەرانە ڕێنوێیی پیشەکار دەکات کەچی شیاو و گونجاوە و خزمەتی خۆی و پیشەکەی دەکات، چیش خراپ و نەگونجاوە نابێ ئەنجامی بدات.هەر پیشەیەکیش بە پێی شێوە و چالاکییەکانی، خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی و پێوەر و هەڵسوکەوتی دیاریکراوی ئیتیکی هەیە.

پرۆفیسۆر(موسا عەلی شیهاب)یش بەم جۆرە پێناسەی دەکات:"لیستێکە کۆمەڵە بەهایەکی ئاکاری و ئینسانی و پیشەیی دەربارەی گروپێکی دیاریکراو لەخۆدەگرێـت،و جەخت لەسەر گرنگی پابەندبوون پێیان دەکاتەوە،لەپێناو ڕاپەڕاندنی ئەرکی پیشەکە بەشێوەیەکی لائیق و ڕێك وپێك".

دوای دەسنیشانکردنی زاراوە پەیوەندارەکان بە چەمکی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی دەکرێ بڵێین" ئەخڵاقی ڕۆژنامەوانی بەشێکی زیندووی ئەخلاقی گشتییە، و ئەخڵاقیش لقێکە لە فەلسەفە ،بەهۆیەوە یارمەتی ڕۆژنامەنووسان دەدرێت چۆن ئەدای پیشەکەیان بکەن کە خزمەت بە خۆیان و کۆمەڵگەکەیان بکات.

زاناو بیرمەندان بە شێوازی جیاجیا پێناسەی ئیتیکی ڕۆژنامەوانیان کردووە، سەرەتا لە فەرهەنگە ئیعلامییەکانەوە دەستپێدەکەین، لە فەرهەنگی ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندندا هاتووە:

"کۆمەڵێك ڕێسای پەیوەندارە بە سلوك و هەڵسوکەوتی پیشەیی کە ڕێکخرا و یان کۆمەڵەیەکی پیشەیی رایدەگەیەنێت و ئەندامانی پەیوەست دەکات بە جێبەجێکردنی و چاودێری جێبەجێکردنیان دەکات، ڕێساکانیش بە شێوەیەکی گشتی بریتی دەبن لە کۆمەڵێك مۆراڵ و ئادابی گشتی کە دەبنە تەواوکەری تەشریعاتە یاساییەکانی تایبەت بە کاری راگەیاندن، و خۆیان لە بنەڕتدا هەڵقولاوی شەرەفی وشە و ئامانجە پیرۆزەکان و بەرژەوەندییە گشتییەکانن".

(محەمەد مونیر حیجاب)یش لە فەرهەنگە ئیعلامییەکەیدا بەم جۆرە پێناسەی کردووە: "ئیتیکی رۆژنامەوانی و راگەیاندن چەمکێکی ئەخلاقییە، بە گرنگترین ئەو چەمکانە هەژمار دەکرێت کە بیردۆزی بەرپرسییارییەتی کۆمەلآیەتی لەسەر بونیادنراوە، بەڵام تا ئێستا ئەو چەمکە تەواو جێگیر و چەسپاو نییە، بەشێکی زۆر لە رۆژنامەوان و توێژەرانی جیهانی رۆژئاوا وەك لەمپەر و ئاستەنگ لەبەردەم کاری رۆژنامەوانی حیسابی دەکەن، و پێیان وایە شێوازێکی نوێی سنووردارکردنی ئازادی رۆژنامەوانییە".

میدیاکارانیش دەستەواژە و تێڕوانینی جیاوازیان هەیە بۆ پێناسەکردنی، ئەوەتا میدیاکاری بەناوبانگ (ئەندرسۆن) دەڵێت:"کۆمەڵە پێوەرێکە ئاڕاستەی کاری بەشداربووان لە کرداری پەیوەندی و گەیاندن دەکات، کە بەهۆیەوە چاودێر و رەخنەگران هەڵسەنگاندن بۆ ئەخلاقیاتی پیشەیی رۆژنامەنووسان دەکەن".

(کۆهین ئەلیۆت)یش بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:" ئاکارێکی پیشەییە، ئەو کێشە و گرفتانە تاوتوێدەکات کە پەیوەندارن بە هەڵسوکەوتی رۆژنامەوان و نووسەر و پەیامنێر و وێنەگر و سەرجەم ئەوانەی بەشدارن لە بەرهەمهێنانی هەواڵ و بلاوکردنەوەیدا ".

لەلای (برخۆف)یش بریتییە لە:"کۆمەڵێك بنەما و پێوەری ئەخلاقی کە هێشتا حوکمی یاسای وەرنەگرتووە، بەڵام پەسندکراوە لە لایەن کۆمەڵە و دەزگا رۆژنامەوانییەکان ،و رای گشتی و رێکخراوە میللی و حیزبییەکان پشتگیری لێدەکەن".

رۆژنامەنووس (ریتش)یش هەر دەربارەی ئیتیکی راگەیاندن دەڵێت:"چەند بژاردەیەکە لەبەردەم میدیاکاران دەربارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنیان لەکاتی بەجێگەیاندنی کارەکانیان".

هەندێکی دیکەش دەڵێن:"ئیتیکی ڕۆژنامەوانی هەموو ئەو یاسا و ڕێسایانە دەگرێتەوە کە پێویستە سەرجەم کارمەندانی ڕاگەیاندن لەبەرچاوی بگرن، یان لەکاتی جێبەجێنەکردنیدا هەست بە شەرمەزاری بکەن".

یان: کۆمەڵێك پێوەر و بنەمایە دەبێ ڕۆژنامەوان و ئەوانەی لە میدیا کاردەکەن خۆخوازانە بە پێی ویژدانی پیشەیی خۆیان لەبەرچاوی بگرن و پەیڕەوی بکەن،بێ هەبوونی هیچ گوشار یان ترسێك لە یاسا.

دوا پێناسەی میدیاکاران و پسپۆرانیش بە پێناسەکەی (ئەحمەد مستەفا عومران) کۆتا پێدێنین کە دەڵێت:"ئیتیکی ڕۆژنامەوانی مەنزومەیەکی پێکهاتووە لەو بنەما و پێوەرانەی هەوڵی ئاڕاستەکردنی ڕۆژنامەوانان دەدات لە هەڵسوکەوتەکانیان لە کاتی ڕاپەڕاندنی کارەکانیان،بەجۆرێك یەکانگیر بێ لەگەڵ وەزیفەی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان و بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگە".

بە پشت بەستن بەو پێناسانەی سەرەوە نووسەری ئەم کتێبەش پێی وایە: ئیتیکی کاری ڕۆژنامەوانی بریتییە لە ئاکارە پەیوەندارەکان بە پیشەی کاری ڕۆژنامەوانی و میدیایی بە هەموو ڕەنگ و جۆرەکانییەوە، کە تەواوی ئەرك و ماف و سروشتی کاری ڕۆژنامەوان و میدیاکاران لە خۆدەگرێت.

بە واتایەکی دیکە دەکرێ بڵێین کۆمەڵە ڕێسا و بنەمایەکە کار لە پێناو خوڵقاندنی هاوسەنگی لە نێوان ماف و سروشتی کاری میدیایی، و بەرپرسیارییەتی میدیا بەرامبەر کۆمەڵگە و بەرژەوەندییە گشتییەکان دەکات.بۆیە گرنگی و تایبەتمەندییەکی بەرچاوی هەیە شان بەشانی یاساکان لە ڕێکخستنی کاری میدیایی ،بەتایبەت لەو کۆمەڵگە و سستەمە سیاسییانەی ڕۆژنامەگەری تیایاندا ئازادە و مافی وەدەستهێنانی زانیاری بە پراکتیك چەسپا و بەرجەستەیە.

## دووەم: سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی و گەشەکردنی

### ١/پێشینەی ئەخلاق

پەیماننامە ئاکارییەکان زادەی ئەم یەك دوو سەدەیەی مێژووی مرۆڤایەتی نین، بەڵکە سەدان هەزارساڵ بەر لە ئێستا مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ژیانی ڕۆژانەی و پەیوەندی نێوان تاکەکان لەلایەك و ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و گەل، لەلایەکی دیکە جۆرێك لە ڕێسا و

یاسا و پەیماننامەی دارشتووە، ئەگەرچی ئەو رێسا و یاسایانە تەواو کت و مت لە یاسا و پەیماننامەکانی رۆژگاری ئێستامان ناچن و لەرووی ناوەڕۆکەوە پێگەیشتوو نەبوونە، وەلی لە ئامانج و مەبەستدا یەکانگیرن لەگەڵ یاساو پەیماننامەکانی ئەو سەردەمە، سەرەتا پەیماننامەکانی ئەخلاق لە (لوائح) لە ژێر ناوی (فەرمانی ئەخلاقی) دەردەچوون و بڕیارەکانی نێوی بە فەرمان ناودەبران.

کۆنترین فەرمانی ئەخلاقی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا فەرمانە ئەخلاقییەکانی (ئۆرۆکاژینا)ی پادشای سۆمەرییەکانە لە وڵاتی میسۆپۆتامیا ،کە مێژووەکەی بۆ قۆناغی دوای نووسین (٦٠٠٠)هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. ئەم فەرمانە بە کورترین فەرمانی ئەخلاقی دادەندرێت، تیایدا جەخت لەسەر پارێزگاریکردن لەسەر ژیان و مومتەلەکاتی خەڵکی بێدەسەڵات لە خاوەن هێزەکان کراوەتەوە، هەروەها بە ئاشکراش رێگە دەگرێت لە دەستدرێژیکردنە سەر هەژار و بێدەسەڵاتان لە لایەن دەوڵەمەند و پیاوانی ئایینییەوە، لەو ئەخلاقنامەیەدا هاتووە:"کاهینەکان بۆیان نیە بە ئارەزووی خۆیان و بێ رەزامەندی خودان دارستانەکان بچنە نێو رەزەکانیانەوەو دار و بەرووبوومەکانیان بقرتێنن".

دووەم فەرماننامەی ئەخلاقی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا یاساکانی (حامورابی)ین کە حیسابی فەرماننامەی ئەخلاقیان بۆ دەکرێت، کە (٢١٠٠)پێش زایین لەسەر دەستی پادشا (حەمورابی)یەوە دارێژراون.

بەدوای ئەو یاسانامەیە (١٠) یاساکەی (موسا) دێت کە خودان گرنگی و تایبەتمەندی بەرچاوە لە رۆژهەڵاتی ناویندا.لە ئیمپراتۆریەتی ئێرانی کۆنیشدا لە فەرمایشت و بۆچوونەکانی (زەردەشت)دا مەسەلەی ئەخلاق وروژێنراوە. شارستانیەتیەکانی هیند و چین، و سەرجەم شارستانیەتە کۆنەکانی دیکەی رۆژهەڵات رێنمایی و فەرمانی ئاکاری و یاساییان دەرکردووە.

لە رۆژئاواش بۆچوون و تێڕوانینەکانی (ئەفلاتون) و (ئەرستۆ) لە سەدەکانی پێش زایین فەرمان و خوێندنەوەی ئەخلاقیان لەخۆگرتووە. لە سەردەمی پاش زاینیش ماوەیەکی زۆر بۆچوونەکانی (تۆماس ئاگۆستین) کاریگەری لەسەر ئەخلاقی مەسیحیەتدا هەبووە. لەسەدەی هەژدەهەمینی زاینیش بەدواوە تێڕوانین و بۆچوونە فیکریەکانی (ئیمانوئێل کانت)و(جان ئۆستارت)و (میل)و چەندانی دیکە ،هەرهەموویان باسیان لە ئەخلاق کردووە.

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ بڵێین سەرجەم بنەما و یاسا و پەیماننامە نێودەوڵەتیەکانی ئێستا زادەی یاسا و فەرمانە ئەخلاقییەکانی قۆناخە مێژوویە جیاجیاکانن، و رەگ و ریشەو بنەچەی هزریان بۆ ئەو سەردەمانە دەگەڕێتەوە.

## ٢/ڕەگە هزرییەکانی پەیماننامەکانی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی

لە بەشی ڕابردوودا بەشێوەیەکی کورت ڕۆشنایمان خستە سەر گرنگترین ئەو بیردۆزە ڕۆژنامەوانیانەی کە کاریگەربوون لە سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی کە دواتر بەهۆیانەوە دەستە و ئەنجوومەنەکانی ڕۆژنامەوانی کەوتنەخۆ بۆ داڕشتنی چەند بنەمایەکی گشتی بۆ ئەندامانیان تا لە چوارچێوەیدا بەشێوەیەکی پیشەگەرانە مومارەسەی پیشەکەیان بکەن.

چەمکی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی چەمکێکی نوێ نیە، سەرەتاکانی بۆ ساڵی ١٩١٦ دەگەڕێتەوە لە وڵاتی سوید، پاشان بۆ وڵاتی فەرەنسا گوازرایەوە، فەرەنسییەکان دوای کۆتاهاتنی جەنگی جیهانی یەکەم دەستیانکرد بە داڕشتنی پەیماننامەیەك بۆ ڕێکخستنی کاری ڕۆژنامەوانی.

ساڵی ١٩٢٦ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاسای(ئاداب) پەسندکرا، ئەم یاسایە ڕەنگدانەوەی دیاری هەبوو لەسەر هەموارکردنی پەیماننامەکانی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی لە سەرتاپای جیهاندا.لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی ڕابردووش لە میانی گرێدانی کۆنگرەی یەکیەتی ڕۆژنامەنووسانی جیهان لە شاری (براگ) زۆر بەوردی تیشك خرایە سەر ئەو بابەتە و ئەندامانی کۆنگرە چەند مەهام و ئەرکێکیان دیاریکرد کە پێویستە لەو قۆناخە، کە قۆناخی ئاشتی بوو لە ئەوروپا و جیهان، ئەنجامی بدات.

لە ئینگلتەراش سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ساڵی ١٩٣٨ یاسایەکی داڕشت کە دەبێ ڕۆژنامە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە کاتی ئەنجامدانی پیشەکەیاندا پەیڕەوی بکەن، لەم ماوەیەدا هەوڵەکان بەردەوام بوون، ساڵی ١٩٣٩ لەکاتی گرێدانی کۆنگرەی جیهانی ڕۆژنامەنووسان لە شاری(بردوا) ئەندامانی کۆنگرە لەسەر پەیماننامەیەك ڕێککەوتن بەنێوی(پەیماننامەی شەرەفی ڕۆژنامەنووسی)،پەیماننامەکە ئەرك و بەرپرسیارییەتی ڕۆژنامەنووسانی بەروونی بەرامبەر کۆمەڵگە دیاریکرد،هاوکات داوای بێلایەنی و مەوزوعیەتیشی لە ڕۆژنامەنووسان دەکرد.

ساڵی ١٩٤٢ یەکەمین کۆنگرەی نەتەوەیی ڕۆژنامەنووسانی ئەمریکا لە وڵاتی مەکسیك بەڕێوەچوو، کۆنگرەکە دەسنیشانی ئەو سزا و بەرپرسیارییەتیانەی کرد کە دەکەونە ئەستۆی ڕۆژنامەنووس و دەزگاکان،هەروەها جەختی لەوەشکردەوە کە پیشەی ڕۆژنامەگەری پیشەیەکە پێویستی بە ڕاستگۆیی و دیقەت و ڕێزگرتن و مەوزوعیەت هەیە،پێشنیاریشی کرد لە کاتی هەر هەڵە و ناوزڕاندنێك ڕۆژنامەنووس یان دەزگاکەی داوای لێبوردن و پۆزش بکات، هەروەها

ئامۆژگاری رۆژنامەنووسانیشی کرد خۆیان لە باسکردنی ژیانی تایبەتی خەڵکی نەدەن ،یان ئەو بابەتانە نەوروژێنن کە پەیوەندیان بە ئادابی گشتی و موقدەساتی کۆمەڵگەوە هەیە.

ئەو کۆنگرە و کۆبوونەوە و گردبنەوە رۆژنامەوانیانە کاریگەری بەرچاویان هەبوو لەسەر دروستبوونی قەناعەتێك لای رۆژنامەنوسان و سەندیکا پیشەییەکان کە تەنها یاساکان بەس نین بۆ رێکخستنی کاری رۆژنامەگەری بەڵکە پەیماننامە ئاکارییەکانیش شانبەشانی یاساکان دەتوانن رۆڵی گرنگ لە رێکخستن و بە پیشەکردنی زیاتری رۆژنامەگەری ببینن، هاوکات هەر بەهۆی ئەم کۆنگرە و گردبوونەوانە دامەزراندنی ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەگەری و راگەیاندن وەك مۆدێکی رۆژنامەگەری لێهات و سەرانسەری جیهانی گرتەوە، ساڵی ١٩٥٨ گەیشتە هیندستان، لە جیهانی عەرەبیشدا میسرییەکان دەستپێشخەر بوون، ساڵی ١٩٦٠ یەکەمین ئەنجوومەنی رۆژنامەوانی لە مێژووی ولاتانی عەرەبی لە میسر دامەزرا،لەرێگەیەوە دەستووری یەکیەتی گشتی رۆژنامەگەرانی عەرەب راگەیەندرا، هەروەها ساڵی ١٩٧٥ ئەنجوومەنێکی هاوشێوە لە ئوستورالیاش بوو بە واقیع.

## ٣/ئیتیکی پیشە و ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەوانی

پاش ئەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرەتاکانی سەدەی رابردوو بیردۆزی بەرپرسیارییەتی رۆژنامەگەری تەبەنیکرد کە هەڵێنجراوی نووسین و بۆچوونەکانی (ولیەم کینگ)و(جۆن ملتۆن) و هەندێك لە ئەندامانی لیژنەی ئازادی رۆژنامەگەری بوون، ئینگلیزەکانیش شوێنپێی ئەمریکییەکان کەوتن، ئەوانیش بیردۆزی بەرپرسیاریەتی کۆمەلایەتیان تەبەنیکرد تا وایلێهات دواتر بیردۆزەکە بە نێوی بیردۆزی ئەنگلۆ-ئەمریکی ناوبرا،لە ئینگلتەرا لیژنەی مەلەکی پەرلەمان بۆ کاروباری رۆژنامەگەری داوای چاوپێخشاندنەوەی بە کاروباری رۆژنامەگەری لە ولات کرد، ئەم داواکارییەی لیژنە پەرلەمانییەکە دەرئەنجامی داواکارییەکانی رای گشتی و گۆمەڵگە بوو، بۆیە لیژنەی ناوبراو چەند جارێك بۆ ئەم مەبەستە کۆبۆوە، دەرئەنجام دامەزراندنی ئەنجوومەنێکی رۆژنامەگەری هاوشێوەی ئەمریکای لێکەوتەوە.

لە ولاتانی جیهانی سێهەمیش دوای نیوەی دووەمی سەدەی رابردوو ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەوانی هاتنە دامەزراندن، ولاتانی هیند و میسر و گانا و ئەندەنۆسیا و تونس پێشەنگ

بوون لەم رووەوە، بەشێوەیەکی گشتیش سەرجەم ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەوانی لە دوو ئاراستەوە سەرچاوە دەگرن:

١/بەدەستپێشخەری رۆژنامەنووسان یان دەزگاکانی راگەیاندن.

٢/لەژێر گوشار و پاڵەپەستۆی دەسەڵاتی یاسایی یان تەنفیزی.

وەك ئاماژەمان پێدا دەرکەوتنی ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەگەری و پەیماننامە ئاکارییەکان هەر لەخۆڕا و بێ هۆکار نەبوون، بەڵکە دەرئەنجامی باردۆخێکی تایبەت و زەرورەتی قۆناخێکی دیاریکراو بوون،بۆیە دەکرێ ئامانجە گشتییەکانی ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەگەری لەم خاڵانەی خوارەوە کۆبکەینەوە:

١/ئیدانەکردنی لادان و هەڵەکانی هەندێك لە رۆژنامەنووسان، و لێپرسینەوە لەگەڵیان بەهۆی هەڵەکانیانەوە.

٢/لێکۆڵینەوە لەو شکایەت و رەخنانەی لە لایەن کەسان و گروپەکانەوە ئاراستەیان دەکرێت دەربارەی کاری نەشیاوی هەندێك لە رۆژنامەنووسان.

٣/بەرپەرچدانەوەی ئەو شکایەت و رەخنانەی بەناحەق وەك تۆمەت ئاراستەی رۆژنامەنووسان دەکرێت، و هیچ بنەمایەکیان نیە.

٤/گەڕاندنەوەی ئیعتیباری مەعنەوی و مادی بۆ ئەو رۆژنامەنووسانەی بە ناهەق تۆمەتبارکراون بەڵام دواتر دادگا بێتاوانیانی راگەیاندووە.

**جگە لەمانە ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەگەری بەچەند وەزیفە و ئەرکێك هەڵدەستن لەوانە:**

١/تەئکید کردنەوە لە راستگۆیی هەندێك لەو هەواڵانەی هۆکانی راگەیاندن بلاۆیدەکەنەوە.

٢/کەمکردنەوەی کێشەکانی ناوزڕاندن و درۆکردن کە ئاراستەی تاك یان دەزگاکانی راگەیاندن دەکرێت .

٣/قوڵکردنەوەی مسداقیەتی دەزگا رۆژنامەوانیەکان لە لای خەڵکدا.

٤/زانیاری بەخشین بە خەڵك دەربارەی گرنگی کاری رۆژنامەگەری بۆ کۆمەڵگە و ئەرك و مافەکانی رۆژنامەنووسان.

٥/پاڵپشتیکردن لە ئازادی میدیا و رۆژنامەگەری، و باشکردنی ئەدای کاری دەزگا رۆژنامەوانییەکان.

٦/پارێزگاریکردن لە نێوەندە میدیاییەکان لە هەر جۆرە سانسۆر و چاودێریکردنێك.

سەبارەت بە جۆر و دابەشبوونی ئەنجوومەنەکانیش دەکرێ بەسەر سێ بەشی سەرەکی دابەشیان بکەین ئەوانیش:

١/ئەو ئەنجوومەنانەی کە نوێنەری دەسەلاّت تیایاندا بەشدارە، یان کارمەندێکی بالاّی دەوڵەت بەنوێنەرایەتی حکومەت ئەندامە، و وەزیری پەیوەندار سەرۆکایەتی دەکات.

٢/ئەو ئەنجوومەنانەی کە رۆژنامەنووس و بلاّوکەری رۆژنامەکان پشکدارن تیایاندا.

٣/ئەو ئەنجوومەنانەی کە پیشەگەران،و رێکخراوە جەماوەرییەکان بەشدارن لە دروستکردنیان.

٤/لە دایك بوونی ئیتیکی رۆژنامەنووسی و پەیماننامە ئاکارییەکان

باسکردن لە ئیتیکی کاری رۆژنامەگەری باسکردنە لەو پەیماننامە و شەرفنامانەی بنەما ویژدانییەکانی کاری میدیایی رێکدەخەن ،و لەدەرەوەی یاساکان هەوڵی هێنانەدی هاوسەنگی دەدەن لە نێوان ئەرك و ماف و سروشتی کاری میدیاکاران لە لایەك، و بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵگە لە لایەکی دیکە. بۆیە بەر لە چوونە نێو باسی سەرهەڵدانی ئیتیکی رۆژنامەوانی ،لە دەستپێکدا فاکتەرەکانی لەدایك بوونی ئیتیك و پەیماننامە ئاکارییەکان دەخەینەڕوو کە بریتین لە:

١/خراپ بەکارنەهێنانی راگەیاندن،بەتایبەت بەکارنەهێنانی وەك چەکی هەڕەشە و گەڤکردن بەسەر پێکهاتە جیاجیاکانی کۆمەڵگە.

٢/دانانی رادەیەك بۆ ئەو فەوزا و پاشەگەردانییەی بەهۆی پەیڕەوکردنی ئازادی رەها لە کاری راگەیاندندا دروست بوبوو.

٣/پارێزگاریکردن لە یەکپارچەیی کۆمەڵگە و ئاشتەوایی کۆمەلاّیەتی،هەروەها مامەڵەکردنی هاوسەنگ لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگە.

٤/رووبەڕووبوونەوەی شوێنەوارە خراپ و نەرێنیەکانی رۆژنامەگەری ناپابەند و سەرەڕۆ.

٥/بەپیشەسازیکردنی رۆژنامە و دەزگاکانی دیکەی راگەیاندن.

٦/نارەزایی میدیای ئەوروپی لە پرۆسەی بە ئەمریکیکردنی نێوەندی رۆژنامەگەری.

٧/لەدایکبوونی کۆمسیۆنی ئازادی چاپەمەنی ئەمریکی و داکۆکیکردنی لە پرسی بەرپرسیارییەتی کۆمەلاّیەتی رۆژنامەنووسان.

٨/پشتگیریکردنی رۆژنامەگەری ئەمریکی لە میدیای بابەتی و هاوسەنگ.

٩/سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی و چاپەمەنی، و کاریگەری لەسەر میدیادا.

١٠/بەکارخستنی میدیا و دەزگا رۆژنامەوانییەکان لە خزمەتی زۆرینەی کۆمەڵگە،بەتایبەت بۆ خزمەتی چینە چەوساوەکان،یان ئەوانەی لەژێر گوشاری ئابووری و کۆمەلاّیەتی دان.

مێژووی لە دایك بوونی ئیتیکی رۆژنامەوانی بۆ سەرەتاکانی سەدی رابردوو دەگەڕێتەوە کاتێك هەریەك لە سوید و فەرەنسا چەند پەیماننامەیەکی شەرەفیان دەربارەی کاری رۆژنامەگەری پەسندکرد، ئینجا ولاّتانی ئەمریکا و ئینگلتەرا و دواتر ولاّتانی دیکەش رێچکەی سوید و فەرەنسایان گرتە بەر.

بیرۆکەی دامەزراندنی ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەگەریش کاردانەوەی دەسەلاّت بوو بەرامبەر بە زالّبوونی ئازادی رەها لە پیشەی رۆژنامەگەریدا،بۆیە لە سەرەتای درووستبوونی ئەو ئەنجوومەنانەدا بەشێکی زۆر لە زانایانی میدیا و پەیوەندیکردن رووبەڕووی بوونەوە و رەخنەی توونديان ئاڕاستە کرد، (ئیفیریت دەنیس)ی پسپۆر لە رۆژنامەگەری رابەرایەتی گردبوونەوەیەکی کرد دژی دامەزراندنی ئەنجوومەنەکان،(دەنیس) پێی وابوو دامەزراندنی ئەو ئەنجوومەنانە شتێکی گرنگ و پێویست نین و دەرئەنجام دەبنە مەترسی بەسەر هۆکانی راگەیاندن و کۆمەڵگەوە، چونکە هەندێك دەسەلاّتی سیاسی لەرێگەیانەوە سانسۆر دەخەنە سەر رۆژنامەنووسان و سزای ئەو دەزگا و میدیاکارانەش دەدەن کە بە پێچەوانەی سیاسەتەکانی دەوڵەت کاردەکەن.

هاوکات بەشێکی دیکە لە پسپۆڕان و توێژەرانی میدیا بەرگرییان لە دامەزراندنی ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەگەری کرد،لەسەرووی هەموویانەوە توێژەری ناودار(جۆن میرەل)، ناوبراو پێی وابوو ئەو جۆرە ئەنجوومەنانە هیچ مەترسییەکیان لەسەر کاری راگەیاندن نیە چونکە ئەرکیان تەنها ئەرکێکی راوێژکارییە و خۆی لە پێشکەشکردنی پێشنیار و یاسا عورفییە نا مولزەمەکان دەبینێتەوە لەپێناو باشترکردنی ئەدای کاری رۆژنامەنووس و دەزگاکانیان.

لە چارەکی کۆتایی سەدەی رابردوودا رێکخراوی یونیسکۆ مەسەلەی ئیتیکی رۆژنامەوانی بە فەرمی تەبەنی کرد، ئەو هەڵوێستەی یونیسکۆ لەمیانی وتارێکدا هات لە ژێر ناونیشانی (یەکپیشەیی لە دامودەزگاکانی راگەیاندندا)، تیایدا ئاماژە بۆ ئەوە کرابوو کە هەنوکە دەستە و ئەنجوومەنی تایبەت بە کارمەندانی میدیا زیاتر لە ١٠٠ ولاّتدا بوونی هەیە بۆیە، مەسەلەی بایەخدان بە پرسی ئیتیك زەرورەتێکە و پێویستە لەمەودوا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی کار لەسەر

بەنێونەتەوەیکردنی بکات، ئیتر لێرە بەدواوە، لەگەڵ گەشەکردنی زیاتری هۆکانی راگەیاندن و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن و گەیاندن، ئەو پرسە رەهەندی فراوانتری وەرگرت و بووە جێی بایەخی زیاتری کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی.

ساڵی ١٩٧٣ لە میانی گرێدانی کۆبوونەوەی سێنزەهەمینی یونیسکو، بڕیارێکی گرنگ دەرچوو تیایدا داوای ئامادەکردنی دیراسەیەك کرا دەربارەی بەها ناوخۆییەکانی دەزگاکانی راگەیاندن، لە بڕیارەکەدا هاتبوو (ئەم کارە لەپێناو هاندانی میدیاکارانە بۆ هەستکردنی زیاتر بە بەرپرسیارییەتی بەجۆرێك هاوشان بێت لەگەڵ دەسەبەری تەواوی ئازادی بلاۆکردنەوە و وەرگرتنی زانیاری)، هەروەها بڕیارەکە پێشنیاری ئەوەشی کرد لە ئامادەکردنی دیراسەکەدا سوود لە پەیماننامە و ئەنجوومەنە نێوخۆییەکانی ولاٌتان وەربگیرێت.لە چارەگی کۆتایی سەدەی رابردوو رێکخراوی یونیسکۆ لە رێگەی راگەیاندنی کۆمەڵە بە هایەکی رۆژنامەوانییەوە بە رەسمی پرسی ئیتیکی رۆژنامەوانی ناساند، لە راگەیەندراوەکەدا جەخت لەسەر سێ خاڵی سەرەکی کرابوو ئەوانیش:

١/رۆژنامەنووس هەڵگری بەرپرسیارییەتێکی سیاسی و فیکرییە، بەرپرسیارییەتێك گرێدراوی سروشتی پیشەکەیەتی و کار لە ویژدانی گشتی کۆمەڵگە دەکات.

٢/پێویستە فێرکردن و رۆشنبیری بێ جیاوازی بۆ هەموو کەس و لایەنێك فەراهەم بکرێ.

٣/نابێ رۆشنبیری گشتی پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە بێ.

لەراستیدا سەرباری هەموو هەوڵەکان بۆ دیاریکردنی ئیتیك و دامەزراندنی ئەنجوومەنەکانی رۆژنامەگەری،مێژووی رۆژنامەگەری و ئەدەبیاتی کاری میدیایی (کیلمنت جۆنز)ی بەریتانی بە خاوەنی بیرۆکەی ئیتیك و داڕێژەری یەکەمی پەیماننامە و شەرەفنامە ئاکارییەکان دەناسێنێ، (کلیمینت)کە پۆستی جێگری سەرۆکی سەندیکای نووسەرانی بەریتانی بەڕێوە دەبرد، چەند پێشهات و روانینێکی دەربارەی داهاتووی کاری میدیایی خستەڕوو،دەکرێ بەم شیوەیە کورتیبکەینەوە:

هۆکانی راگەیاندن و پەیوەندیکردن ئێستا و لە داهاتووش بەشێوەیەکی چڕتر رووبەڕووی دوو کۆسپ و تەگەرە دەبنەوە کە هەردووکیان کاریگەری راستەخۆ و توندیان دەبێ لەسەر لایەنی پیشەیی کارمەندانی ئەو بوارە، دەکرێ ئەو دوو کۆسپەش لە دوو خاڵدا کۆبکەینەوە:

١/لایەنی ئابووری:بەهۆی تێچوونی پارەیەکی زۆر لە بەڕێوەبردنی دەزگاکانی راگەیاندن و گرانی نرخی ئامێر و کەلوپەلەکانی پیوەندیکردن، دەزگاکانی راگەیاندن ناتوانن بەخۆیان

خۆیان بەڕێوە ببەن،بۆیە بە ناچاری پەنا بۆ ڕێکلامکردن دەبەن،لێرەدا ئیشکالیەتی ئەوە سەرهەڵدەدا کە چۆن ڕێکلام بکرێت؟ پێویستە پرسی ڕێکلامکردن بە وردی لە لایەن دەزگاکانەوە تاوتوێبکرێ، بەشێوەیەك بە خراپی بەسەر لایەنی پیشەیی دەزگاکان و کۆمەڵگەدا نەشکێتەوە.

٢/مسداقیەتی ڕۆژنامەنووس و دەزگاکانی ڕۆژنامەگەری: مەسەلەی مسداقیەت تەنها جێبایەخی دارێژەرانی بەها گشتییەکانی کاری میدیا نیە بەڵکە جێبایەخی خەڵکی سادە و وەرگری هەواڵ و زانیارییەکانیشە، مسداقیەت لە کاری میدیایدا تەنها بریتی نیە لە کۆکردنەوەی زانیارییەکان بە ئەمانەتەوە. بەڵکە دارشتن و گەیاندنی ئەو زانیارییانە وەك خۆی و بێ دەستکاری و رتوش، لایەنی دووەمی مسداقیەتە.

لێرەوە زۆربەی لێکۆڵەران لەسەر ئەوە کۆکن پەیپەرە ئاکارییەکانی کاری میدیایی نوێ و تازە لەدایك بوون، زۆرێك لە وڵاتان تا ئێستا، لە سەردەمی جیهانگەرایی میدیادا خاوەن سیستەمێکی ئیعلامی رێك و پێك نین، بگرە هەندێکیان هاوشێوەی سیستەمەکانی سەدەکانی ناوەڕاستن و بە کەڵکی ئەو سەردەمە نایەن، هەروەها هەندێکی دیکەیان هیچ کارنامەیەکی تایبەت بە ئاکاری راگەیاندنیان نیە یا گەر هەشیانبێ بەزۆر و لە ژێر گوشاردا ئیقراریان کردووە. بۆیە دەکرێ بڵێین ئەو وڵاتانەی خودان پەپەری ئاکاری کاری رۆژنامەوانین و بە فعلی کارپێدەکەن، کەمینەن و بەپەنجەکانی دەست هەژماردەکرێن، هەر بۆیە دەکرێ وڵاتان لەم رووەوە بەسەر چوار بەش دابەش بکەین :

١/وڵاتانێك خاوەن سیستەمێکی رێك وپێکی ئیعلامی نین، ئەوەی هەشیانە هەڵقوڵاوی دەسەڵاتی سیاسییە، ژمارەی ئەو جۆرە وڵاتانە یەگجار زۆرە.

٢/لە هەندێك وڵاتدا میدیاکاران هەست بەوە دەکەن گۆمەڵگە لە کار و مەهامی ئەوان رازی نیە و بە ئەرکەکانی خۆیان هەڵنەستاون، لێرەوە میدیاکاران بە شێوەیەکی خودی و خۆنەویستانە چاودێری کارەکانیان دەکەن و هەڵیدەسەنگێنن.

٣/لە هەندێك وڵاتیشدا دەوڵەت بە تەواوەتی دەسەڵاتی بەسەر دەزگا رۆژنامەوانییەکان سەپاندووە، بۆیە هەر کاتێك پەرا و یان پەیماننامەی ئاکاری رادەگەیەندرێت هەموو لایەك بێ چەندوچوون دەبێ قەبوولی بکەن.

٤/له هەندێك وڵاتیشدا پەیپەرە ئاكارییەكان تەواو هەڵقوڵاوی ویست و خواستەكانی رۆژنامەوانانە و دەوڵەت هیچ هەژموون و گوشارێكی نیە لە دارِشتنیاندا، رۆژنامەنووسانیش زاتی و خۆویستانە لەكاتی ئەنجامدانی كارەكانیاندا رەچاوی دەكەن.

لەلایەكی دیكەوە ئەو گۆڕانكاری و پێشكەوتنە بەرچاوەی لە سەرەتاكانی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ئیمرۆ دەزگاكانی پەیوەندیكردن و راگەیاندن بە خۆیەوە دەبینیّ، هەر لە شۆڕشی پیشەسازی و چاپەمەنی تا دەگاتە شۆڕشی زانیارییەكان و تەكنەلۆژیای رەقەمی(دیجیتال)، پرسی سەرهەڵدان و پێویستی دارِشتنی كارنامەكانی شەرەف یان ئیتیكی رۆژنامەوانیان خێراتر كرد، بەو پێیەی كۆمەڵە بەهایەكن مافی لایەنە جیاجیاكانی كرداری پەیوەندیكردن راگەیاندن دەپارێزن. هەروەها دوابەدوای بە پیشەسازیكردنی رۆژنامەگەری و سەرهەڵدانی چەمكی ئابووری راگەیاندن و تەماشاكردنی پیشەی رۆژنامەوانی وەك جۆرێك لە بیزنس و كاری بازرگانی ،هێندەی دیكە مەسەلەی كارنامە ئەخلاقیەكان بوونە زەرووره‌ت، چونكە دوای ئەم بە بازرگانیكردنە خەریك بوو مافی رۆژنامەنووسان دەخورێت و تەنها بەشێكی یەكجار كەمیان لەو قازنجە داراییە پێدەدرا كە خاوەن رۆژنامە و دەزگاكانی دیكەی راگەیاندن وەدەستیان دەكەوت.

### ٥/بەپیشەناساندنی كاری رۆژنامەگەری

پاش كۆتاهاتنی جەنگی جیهانی یەكەم بارودۆخێكی ئابووری و كۆمەڵایەتی دژوار ئەورووپای گرتەوە، ئەنجامە خراپەكانی جەنگ رەنگدانەوەی لەسەر سایكۆلۆژیەت و هەڵسوكەوتی رۆژنامەنووسانیش دیاربوو، ناكۆكی و پەرتەوازەییەكی بەرچاو لە نێوەندی رۆژنامەگەری ئەوروپا دەبیندرا، بەر لە هەڵگیرسانی شەڕیش جیاوازی لە نێوان رۆژنامەنووسان هەبوو دەربارەی دامەزراندنی سەندیكا و رێكخراوە پیشەییەكان، میدیاكاران لەم رووەوە بەسەر سیّ بەش دابەشببوون، هەندێكیان بۆ پارێزگاریكردن لە مافە پیشەییەكانیان چوبوونە نێو ئەو رێكخراوانەی داكۆكیان لە مافی كرێكاران دەكرد، هەندێكی دیكەیان داوایان لە خاوەن كارەكانیان دەكرد تایبەتمەندییەكانی پیشەكەیان وەك هەر پیشەیەكی دیكەی دەستی بناسێنن، بەشی سێهەمیش لە ناوەڕاست مابوونەوە و نەچووبوونەوە نێو هیچ دەستەو رێكخراوێك.

تەنگژە ئابوورییەكەی جیهان لە ساڵانی ١٩٢٩-١٩٣٣ كاریگەری بەسەر هەموو كایەكانی ژیان هەبوو بە بواری رۆژنامەوانیشەوە، رۆژنامەنووسان هاوشێوەی خاوەن پیشەكانی دیكە

کەوتنە ژێر گوشاری بارودۆخێکی ئابووری سەخت، ئەو دەستکەوتە مادییەی مانگانە بەرامبەر کارەکەیان پێیان دەدرا پێداویستییەکانی ژیانی دابیننەدەکردن، هەلاوسانی ئابووری ژیانی هەموو لایەکی سەختکردبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی ژمارەیەکی زۆریشیان بێکار مابوونەوە و دەزگاکانیان کۆتایی بە خزمەتگوزارییان هێنابوو، ئەم بارودۆخە نوێیە قەناعەتێکی لە نێوەندی ڕۆژنامەگەری دروستکرد کە ئیتر لەمەودوا ئەوانیش هاوشێوەی خاوەن پیشەکانی دیکە پێویستیان بە نێوەندێك هەیە داکۆکیان لێبکا و شێوەی کارکردنیان تەنزیم بکات و هەوڵ بۆ زیادکردنی موچەکانیان بدات، بە شێوەیەك بارتەقای هەلاوسان و گرانی بازاڕ بێت،یان لە کاتی بێکاریدا زامنی وەرگرتنی بەشێك لە مووچەکانیان بکات.

ئەم بزاڤەی ڕۆژنامەوانانی ئەوروپا لە پێناو بە پیشەناساندنی کارەکەیان دەنگ و سەدایەکی باشی هەبوو، بەلاّم ولاّتانی ڕۆژئاوای بەسەر دوو بەرە دابەشکرد:

١/هەندێك دەوڵەت ڕێکخستنی کاری ڕۆژنامەوانییان بەزەروورەت زانی بەتایبەت لەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە مووچە و پەیوەندی نێوان ڕۆژنامەوان و خاوەن کارەوە هەیە، بۆیە هەرزوو ئەو مەسەلەیان تەبەنیکرد.

٢/بەشی دووەمیشیان قەناعەتی وابوو پێویستە نێوەندی ڕۆژنامەگەری هەوڵی دامەزراندنی سەندیکا و ڕێکخراوی تایبەت بەخۆی بدات،تا بەهۆیانەوە پارێزگاری لە مافەکانیان بکەن.

لەم سەروبەندەدا ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی لە ژنێڤ، هاوکات لە گەڵ دەنگ و داواکاری ڕۆژنامەنووسان بۆ ڕێکخستنی کاری ڕۆژنامەوانی، ساڵی ١٩٢٨ بڕیارێکی گرنگی لەم بارەیەوە دەرکرد کە جەختی لەسەر دابینکردنی ئەمن و ئازادی و گوزەرانی شیاو بۆ ڕۆژنامەوانان دەکرد.

## دەقی ڕاپۆرتەکەی ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی

"لەگەڵ ئەوەی ڕۆژنامەگەری لەوانەیە لای هەندێك وەك بابەتێکی بازرگانی تەمەشا بکرێت، بەلاّم سەرباری ئەمە هەڵگری کۆمەڵە بەها و ئاکارێکە کە تارادەیەك سروشتێکی تایبەتی پێدەبەخشن، ڕۆژنامەوان تەنها وەرگر و وەدەستهێنی پارەیەکی دیاریکرا و نییە بەرامبەر ئەو کارەی ئەنجامی دەدات، بەڵکە کارەکتەرێکی خودان فیکر و قەناعەتپێهێنەریشە، هەر ئەمەشە سروشتی کاری ڕۆژنامەنوس لە کارەکانی دیکە جیا دەکاتەوە کە سەروبەندێکی ئەوتۆیان لەگەڵ مەسەلەی فیکر و قەناعەتپێهێنان نیە، پێویستە ڕۆژنامەوانی جێگەی تەقدیر

و ڕێزی تایبەتی گۆمەڵگە بێ،دەبێ لایەنی پەیوەندار کەشوهەوای گونجاوی کارکردن بۆ ڕۆژنامەنووسان ئامەدەبکەن ،دابینکردنی ئەمن و ئازادی و گوزەرانی شیاو، مافە بنەڕەتییەکانی کاری ڕاگەیاندنن".

بەوردبوونەوە لەم بڕیارە دەکرێ سێ خاڵی بنەڕەتی دەسنیشانبکەین، کە بڕیارەکە لەخۆی دەگرێ و ڕێگە بۆ مەسەلەیەکی گرنگ خۆشدەکات، ئەم خالآنەش بریتین لە :

١/ڕۆژنامەگەری تەنها کارێکی بازرگانی نیە بەڵکە هەڵگری چەند بە ها و ئاکارێکیشە.

٢/ڕۆژنامەنووس مرۆڤێکی خاوەن فیکرە.

٣/زەرورەتی دەسەبەرکردنی ئەمن و ئازادی و بژێوی ڕۆژنامەنووسان.

لەڕاستیدا باسکردنی بڕیارەکەی ڕێکخراوی کار لە مەسەلەی گوزەرانی ڕۆژنامەنووسان و بارودۆخی کارکردنیان، ڕاستەوخۆ داننانە بە مەسەلەیکی گرنگ ئەویش مەشروعیەتی پیشەی ڕۆژنامەوانی و ناساندنی ئەو کارەیە وەك پیشەیەکی سەربەخۆ، دەکری ئەم بڕیارەی ڕێکخراوی نێوبراو وەك سەرەتاکانی بەفەرمی ناساندنی پیشە ڕۆژنامەوانی دابنێین.

لەلایەکی دیکەوە ئەوەی ئەهمیەتی ئەو بڕیارە زیاتر دەکات ئەوەیە کە تەنها باس لە مافی ڕۆژنامەوانان و ڕێکخستنی کارەکەیان ناکات، بەڵکە مەسەلەی بەرپرسیارییەتی کەسی ڕۆژنامەوانیش تاوتوێدەکات کە یەکڕاست پەیوەندی بە پرسی ئیتیکی پیشەکەوە هەیە، ئەوەتا لە کۆتایی بڕیارەکەدا ڕێکخراوی کار داوای دامەزراندنی دادگای پسپۆر دەکات بۆ لێکۆڵینەوە لە سلوکی ڕۆژنامەنووسان و دەڵێت:(( دامەزراندنی دادگای پیشەیی پسپۆڕ بۆ لێکۆڵینەوە لە هەڵسوکەوتی ڕۆژنامەوانان، کارێکی پێویستە و قورس نیە...)).

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن لە پێنج ساڵی یەکەمی دامەزراندنی دادگا پیشەییەکان، دادەر و کارمەندانی دیکەی ئەو دادگایانە تووشی زەحمەتییەکی زۆر دەبوونەوە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە دۆسییەکان، بەهۆی دژایەتیکردنیان لە لایەن ڕۆژنامەوانانەوە و ئیعتیراف نەکردن بە دادگاکە، چونکە زۆربەی میدیاکاران دامەزراندنی دادگای لەو شێوەیان بە هەوڵدان بۆ تەسککردنەوەی پانتایی ئازادییەکان لەقەڵەم دەدا، بەڵام لەبەرامبەردا زۆرینەی حکومەتەکان پێشوازییان لەو بیرۆکەیە کرد و کەوتنە دامەزراندنی دادگای پسپۆڕ، چونکە بە بۆچوونی ئەوان لەڕێگەی ئەو دادگایانەوە دەتواندرێ ڕۆژنامەگەری پابەند و بەرپرس لە ڕۆژنامەگەری نامولتەزیم جیا بکرێتەوە ،هاوکات هۆکارێکیش دەبێ بەرزەفتکردنی میدیاکاران.

هەروەك ئاماژەمان پێدا بە پیشەناساندنی کاری ڕۆژنامەوانی لە ڕاپۆرتەکەی ڕێکخراوی کار و باسکردن لە بەرپرسیارییەتی میدیاکار، پاڵنەرێکی دیکەبوو بۆ بیرکردنەوەی زیاتر لە داڕشتنی کۆمەڵە بەها و پێوەرێك بەهۆیەوە هێڵە گشتییەکانی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی دیاریبکرێت، ئەوەتا هەر چەند ساڵێکی کەم دوای ڕاپۆرتەکەی ڕێکخراوی نێوبراو چەند رەشنوسێك دەربارەی بەها گشتییەکانی فیکر و دەربەڕین بەدیارکەوتن، بەدوای ئەمەدا کۆمەڵە دەستپێشخەرییەك بۆ داڕشتنی بەها گشتییەکانی رادەربڕین لە ئاستی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی خرایە ڕوو، لەوانەیە کۆنترینیان پڕۆژە یاسای بەهای ڕۆژنامەوانی بێ لە ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ساڵی ١٩٣٦ لەلایەن لیژنەی کۆنگرەی ڕۆژنامەوانییەوە پەسندکرا، و ساڵی ١٩٥٠ یش دووبارە لە لایەن هەمان لیژنەوە ئیقرار کرایەوە.

گەر پێش جەنگی جیهانی دووەمیش لەو جۆرە هەولاَنە بکۆڵینەوە پێویستە باس لە دامەزراندنی یەکیەتی ڕۆژنامەنووسانی نێودەوڵەتی بکەین لە ساڵی ١٩٢٦، یەکیەتی نێوبراو چەند هەنگاوێکی دیارکرد بۆ ڕێکخستنی کاری ڕۆژنامەوانی کە دامەزراندنی (دادگای نێودەوڵەتی شەرف)ی ساڵی ١٩٣١ و (پەیماننامەی شەرەفی پیشەگەری) ساڵی ١٩٣٩ لیکەوتەوە.

ساڵی ١٩٤٣ یەکیەتی نێودەوڵەتی کۆمەڵەی بلاَوکەر و بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەکان ڕاگەیەندرا، ئەم یەکیەتییە لە کۆنگرەکانیدا چەند بنەمایەکی تایبەت بە ڕێگەگرتن لە بلاَوکردنەوەی هەواڵی ناڕاستی داڕشت، دواتر یەکیەتی ڕۆژنامەوانی نێودەولَتیش پەسندیکرد.

کۆمەڵەی بێژەرە لۆکاڵەکانی ئەمریکاش|(**LAAB**) ساڵی ١٩٥٥ بنەمانامەیەکی بەهایی بڵاوکردەوە، لەو بنەمانامەیەدا ئەرکە سەرەکییەکانی ڕادیۆ و کارمەندانی ئەو بوارە خرابووە ڕوو، لەگەڵ دەسنیشانکردنی ئادابە سەرەکییەکانی کاری ئێستگەیی .

پاش هەڵوەشاندنەوەی یەکیەتی ڕۆژنامەنووسانی نێودەوڵەتی لە میانی جەنگی جیهانی دووەمدا، دووبارە ئەم یەکیەتییە لە ساڵی ١٩٥٢ دامەزرایەوە، لە سێهەمین کۆنگرەی ڕێکخراوەکەدا کە ساڵی ١٩٥٤ لەشاری (بۆردۆ) بەڕێوەچوو، بنەماکانی (فرانسوا جیبر)ی پەیوەست بە ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسی پەسندکرد، کە تیایدا هاتبوو"''نابی ڕۆژنامەنووس لەپێناو وەدەست هێنانی هەواڵ و بەڵگەنامە و وێنەدا پەنا بۆ کاری ناشەرعی و نادروست ببات، هەروەها نابێ بەهیچ شێوەیەك پارە و دیاری و یارمەتی دارایی بە ناوی پیشەکەی یان لەمیانی ئەنجامدانی کارەکەی، لە هیچ کەس و لایەنێك وەربگرێت''.

ساڵی ١٩٤٦ فدراسیۆنی نێودەڵەتی رۆژنامەنووسان راگەیەندرا، ئەم فدراسیۆنە خۆی زیاتر بۆ بلاٌوکردنەوەی بەها پیشەییەکان تەرخانکرد، ساڵی ١٩٦٠ لە میانی کۆنگرەی دووەمیدا سەرجەم بەها ئاکارییە راگەیەندراوەکانی خۆی وەك بڕیار ناساند، لە بەشێکی ئەو بەندە یاساییانەدا هاتبوو : "ئێمە پێمان وایە پێویستە رۆژنامەنووس وەك ئەرك تەمەشای بەها ئاکارییەکانی پیشەکەی بکات، وپارێزگاریان لێبکات، هەروەها دەبێ بە بایەخەوە لە ئەرکەکانی سەرشانی بڕوانێ، هاوکات ئەرکی ئێمەشە نەوەی داهاتووی رۆژنامەنووسان لەسەر هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی و دووركەوتنەوە لە دەمارگیری و خۆبەخشین لە پێناو داچەقاندنی بەهاکانی ئاشتی و ئازادی و دیموکراسی رابهێنین".

لە ساڵی ١٩٦٢ فدراسیۆن سێهەمین کۆنگرەی گرێدا،لەوێدا یەك لە هەرە گرنگترین بڕیارەکانی خۆی راگەیاند کە لە بەشێکیدا هاتبوو:" بنەمای سەرەکی بەهاکانی رۆژنامەوانی خۆی لەو خاڵەدا بەرجەستە دەکات کە رۆژنامەنووس بەشێوەیەکی بابەتیانە بنووسێت،نووسینێك کتومت تەعبیر لە هەقیقەت بکات،پێویستە نووسینەکانی هەڵقوڵاوی قەناعەت و ویژدانی بێ و گوزارشت لە داوا و حەز و پێویستییەکانی جەماوەر بکات".

یەکیەتی رۆژنامەوانی ئەمریکای لاتینیش (**FELAP**) کە ساڵی ١٩٧٦ لە مەکسیك دروستبوو بایەخێکی زۆری بە مەسەلەی بەها ئاکارییەکان دا، ئەویش کۆمەڵە بنەمایەکی راگەیاند، لەگەڵ ئەوەی بنەماکانی حوکمی تەشریعاتی یاساییان نەبوو بەڵام (٦٠) هەزار ئەندام و (٢٠ ) رێکخراوی رۆژنامەوانی پابەندی بنەمانامەکانی بوون، بەگشتی بنەماکانی یەکیەتی نێوبراو جەختی لەسەر دوو خاڵی گرنگ دەکرد:

١/چەمکی رۆژنامەوانی لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە مافی هەموو لایەکە بەشێوەیەکی راست و دروست زانیاری دەست بکەوێ و ئاگاداری رووداوەکانی دونیا بێ.

٢/پێویستە مرۆڤایەتی کار بۆ نەهێشتنی سیستەمی خاوەندارێتی دەزگاکانی راگەیاندن بکات.

لە چارەگی کۆتایی سەدەی رابردووشدا، رێکخراوی یونیسکۆ لەرێگەی راگەیەندراوێکەوە کە بەها گشتییەکانی کاری میدیایی لەخۆدەگرت، بەفەرمی مەسەلەی ئیتیکی لە کاری رۆژنامەوانی پەسند کرد، بەمجۆرە ئیتر لەم ساوە پرسی ئیتیك و پەیماننامەکانی شەرەف لە بازنەی لۆکاڵیەت و ناوچایەتی هاتە دەرەوە و رەهەندێکی فراوانتریان وەرگرت ئەویش بەجیهانیبوونە.

# دەرووی دووەم

## پەیماننامەکانی ئیتیکی رۆژنامەوانی

بەشی یەکەم: جۆر و گرنگی پەیماننامەکانی ئیتیکی رۆژنامەوانی.

بەشی دووەم: پەیماننامەی شەرەڤی کوردستانی و نموونەی چەند پەیماننامەیەکی دیکەی ولاَتان

# بەشی یەکەم

## جۆر و گرنگیی پەیماننامەکانی ئیتیکی رۆژنامەوانی

بەشێوەیەکی گشتی ئەخلاقیاتی میدیا و پەیماننامەکانی شەرەف جەخت لەسەر هاوسەنگی دوو تای ئەو هاوكێشە ئیعلامییە دەكەن كە لە ئازادی و بەرپرسیارییەتی پێكدێت، نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان ئەو دوو چەمكە لە هەر كردارێكی میدیایی و گەیاندندا واتای ناهاوسەنگی و ناتەواوی پرۆسەی گەیاندن دەگەیەنێت، وەك لە دەرووی یەكەمدا ئاماژەمان پێدا بیرۆكەی بەرپرسیارییەتی كۆمەلایەتی سەرەتاكانی بۆ سەدەی پانزەهەم دەگەرێتەوە كە سەردەمانی لە دایك بوونی رۆژنامەگەرییە، بەلام ئەم بیرۆكەیە ئەو كاتە تەواو كامڵ و پێگەیشت كاتێك لە كۆتاییەكانی سەدەی هەژدەهەم پەیڕەوكردنی ئازادی رەها لە كاری رۆژنامەوانیدا بوو بە مەترسی لەسەر ئازادییەكانی تاك و كۆمەڵ و بەرژەوەندییە گشتییەكان، چەمكی بەرپرسیارییەتی كۆمەلایەتی لەگەڵ خۆیدا دەرگەی لەبەردەم چەندین بابەت و پرسی دیكەی رۆژنامەوانی والا كرد كە گرنگترینیان مەسەلەی ئیتیكی رۆژنامەوانییە.

تا سەرەتاكانی سەدەی رابردوو چەقی لێكۆلێنەوەكانی بواری میدیا و توێژینەوەی بیرمەندان بایەخدان بوو بە ناساندنی كاری میدیایی وەك زانستێك و داچەقاندنی بنەما سەرەكییەكانی، توێژینەوە ئەكادیمییەكان نەزۆر و نە كەم بەلای رەهەندە ئەخلاقییەكانی كاری رۆژنامەگەریدا نەچوبوون، لە بیستەكانی سەدەی رابردوو سەرەتاكانی بایەخدان بەو بابەتە سەریهەڵدا كەخۆی لە دامەزراندنی ئەنجوومەنەكانی رۆژنامەوانی و راگەیاندنی پەیماننەمەكانی شەرەفدا بینیەوە، وەلێ تا ئەمڕۆشی لەگەڵ بێ لایەنی ئەخلاقی كاری راگەیاندن و ناكۆكی نێوان بلاوكار و خاوەن دەزگا و رۆژنامەنووسان و بالادەستانی سیاسەت و ئابووری، هەر بەردەوامە و لە پەرەسەندندایە.

میدیا پەیامێكی ئەخلاقی و مەعریفی هەستیاری لە ئەستۆدایە،هاوكات خاوەن نفوز و دەسەلاتێكی زەبەلاحیشە، بۆیە ئەوەی بۆ كەسی رۆژنامەوان دەرەخسێ لە پێگەو كاریگەری بۆ

کەسێکی دیکەی ئاسایی نەڕەخساوە، زۆرێك لە پسپۆڕان، میدیا بە چەکی دووسەرە دەشوبهێنن، دەکرێ بۆکاری چاکە و باش بەکاربهێندرێت، هاوکات هۆکارێکیش دەبێ بۆ خراپە و وێرانکاری، کەواتە بۆ رووبەڕوبوونەوەی ئەو واقیعە پێویستمان بە دەستووری ئەخلاقی کاری رۆژنامەوانی یان پەیماننامەی شەرەف و تەشریعات هەیە، چونکە رۆژنامەوانی نامولتەزیم و سەرەڕۆ مەترسییەکی گەورەیە لەسەر بەرژەوەندییەکانی تاك و کۆمەڵگە.

## یەکەم: گرنگی و ئامانجەکانی ئیتیکی رۆژنامەوانی

### ١/گرنگی پەیماننامە ئاکارییەکان

پەیماننامەکانی شەرەف گرنگی تایبەتیان هەیە لە کاری میدیایدا، وەك زەروورەتێکی حەتمی حیساب دەکرێن، توخمی سەرەکی سەرکەوتنی هەر دامودەزگایەکی رۆژنامەوانین، بەو پێیەی ئەرك و مافی رۆژنامەوانان و قودسیەتی گشتی و بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ لەبەرچاو دەگرن، گرنگی ئیتیك لە پیشەی راگەیاندندا خۆی لەخۆیدا ئیقرارکردنە بە گرنگی و هەستیاری ئەو پیشەیە، بەو هۆیەی هۆکاری سەرەکی دەستکەوتنی زانیاری و خسنەڕووی راستییەکان و هەندێکجاریش دروستکردنی رای گشتییە دەرباری پێشهات یان پرسێکی دیاریکراو.

گرنگی هەرە بەرچاوی ئیتیك لەوەدایە هاوسەنگی لەنێوان دوو پرسە هەستیارەکەی میدیا کە ئازادی و بەرپرسیارییەتیە دەخولقێنێ، بەهۆی کۆمەڵ تەشریعاتێکی ئەخلاقییەوە بازنەی ئازادییەکانی رۆژنامەوان دیاردەکات، هاوکات بەرپرسیارییەتیەکانیشی بەرامبەر کۆمەڵگە دەسنیشان دەکات.

گرنگییەکی دیکەی مەسەلەی ئیتیك دیارکردنی مافەکانی میدیاکارە، مافەکانی لەو دەزگاییەی کاری تیادا دەکات، لەگەڵ مافە یاسایی و پیشەییەکانی، هاوکات بەرچاوروونیشە بۆ رۆژنامەوان سەبارەت بەو ئەرکانەی دەکەونە ئەستۆی.

ئیتیك بەوردی ئەخلاقی کارمەندانی راگەیاندن هەر لە پەیامنێر و نووسەر و وێنەگر و بەڕێوەبەری نووسین و رێکخەری ئەرشیف و تادەگاتە سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیاز و خاوەنی دەزگاکان، دیاردەکات.

ئیتیك چەکێکی کاریگەری دونیای میدیایە، ئەوەندەی سوود و بەرهەمی بۆ رۆژنامەنووس هەیە ئەوەندە مایەی سانسۆر و کۆت و بەندکردنی نیە، بیرمەندی بەناوبانگ (برکۆف) لە کتێبە بەناوبانگەکەی (رۆژنامەگەری سۆسیالیزم) دەڵێت:"ئیتیکی رۆژنامەوانی کۆمەڵە بنەما

و پێوەرێکی ئاکاری و ڕۆژنامەوانی پەیوەست بە سلوك و شکۆ و ناوبانگ و شەرەفی پیشەیی کەسی ڕۆژنامەنووسەوە هەیە، بەشێوەیەکی گشتیش مافەکانی میدیاکار و سروشتی پیشەکەیان لەبەرچاو دەگرێ، ئەوجا بەرژەوەندی و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە".

ویژدانی میدیاکار لایەنێکی گرنگی مەسەلەی ئیتیکە، ویژدانی ڕۆژنامەوان لە یاسا و تەشریعاتەکان گرنگترە چونکە ڕێگرییەکی ویژدانی-خودی خۆڕسکانەیە، لە هەموو کات و شوێنێکدا لە گەڵ ڕۆژنامەوانە و بەربەستە لەبەردەم لادان و خراپ بەکارهێنانی پیشەکەی، بۆیە هەڵسوکەوتی پیشەگەریانەی میدیاکار مەسەلەیەکی پیرۆزە و ڕەهەندی یاسایی و ئاکاری هەیە، بەو پێیەی میدیاکار مرۆڤێکی خاوەن بەرپرسیارییەتە بەرامبەر کۆمەڵگەکەی.میدیاکار بە زۆر جۆر و شێوە دەتوانێ کۆمەگە بەلاڕێدا ببات، بۆ نموونە دەتوانێ هەندێك زانیاری گرنگ لە کۆمەڵگە بشارێتەوە و بزریان بکات، هاوکات دەشتوانێ هەندێك ڕوودا و هەواڵ لە قەبارەی خۆیان گەورەتر بکات،بێگومان ئەمەش دەچێتە خانەی گەمەکردن بە عەقڵی خەڵك و پەیڕەوکردنی دوو سیاسەتی ئیعلامی دژبەیەك،کە لایەنی نا ئەخلاقی دەزگاکە و دووفاقی گوتارەئیعلامیەکەی نیشان دەدات. کەواتە بەپشت بەستن بەهەموو ئەمانە دەتوانین بڵێین وێڕای گرنگی ئیتیك لە هێنانەدی هاوسەنگی لەنێوان ئازادی و بەرپرسیارییەتی ڕۆژنامەوان، ئەوا مەسەلەیەکی ویژدانیشە، وەك گرێبەستێکی ئەخلاقی وایە لە نێوان کەسی ڕۆژنامەنووس و پیشەکەی.

### ٢/ئامانجەکانی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی

لێکۆڵینەوە ڕۆژنامەوانیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئێستا زیاتر لە (٢٠٠) وڵات لەهەوڵی پێشخستن و گۆڕانکارین لە سیستەمی ڕاگەیاندنیاندا، هەروەها نزیکەی (٥٠) وڵات خاوەن پەیپەری پەیماننامەی ئاکارین، هاوکان (١٥٠) وڵاتی دیکەش گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی کە پەیماننامە ئاکارییەکان دەتوانن شان بەشانی یاساکان بواری میدیا کۆنترۆڵ بکەن، بۆیە لە هەوڵی داڕشتنی پەیپەری ئاکارین.

پەیماننامە ئاکارییەکان زەرورەتی حەتمی ئەمڕۆی دونیای ڕۆژنامەوانین، دەکرێ ئامانجە سەرەکییەکانیان لە سێ خاڵی سەرەکی کۆبکەینەوە:

١/پارێزگاریکردن لەوانەی کە لەپێناو ئەواندا کرداری پەیوەندیکرن ئەنجام دەدرێت، بە واتایەکی دیکە پاراستنی کۆمەڵگە لە خراپ بەکارهێنانی هۆکانی ڕاگەیاندن.

٢/پارێزگاریکردن لە تەواوی کارمەندانی ڕاگەیاندن لە هەر شێوەیەکی قۆرخکاری یان گوشارخستنە سەریان لەلایەن خاوەن دەزگاکانەوە بۆ ئەنجامدانی کارێك کە یەکانگیر نیە لە گەڵ وەزیفەی ڕاگەیاندن.

٣/ڕاهێنانی کەناڵەکانی پەیوەندیکردن لەسەر ڕەچاوکردنی دوو لایەنی گرنگ لە کارکردندا،یەکەمیان:مافی بەدەستهێنانی زانیاری کارمەندانی ڕاگەیاندن ،دووەمیان:مافی ڕادەربڕینی جەماوەر لەو کەنالانە و پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندی گشتی.

## دووەم: جۆرەکانی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی

تا ئێستا لە لایەن نێوەند و سەندیکا و ڕێکخراوە ڕۆژنامەوانییە لۆکاڵ و نێودەوڵەتییەکانەوە دەیان پەیماننامە و ڕێسا و یاسا دەربارەی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی پەسندکراون و بوونەتە بنەمای ئەخلاقی بۆ کاری ڕۆژنامەنووسی، بەو ئامانجەی وەك پەیمانی شەرەف لە لایەن ڕۆژنامەوانانەوە پەیڕە و بکرێن.

بەشێوەیەکی گشتی پەیماننامە ئاکارییەکانی کاری ڕۆژنامەوانی دوو شەکڵ و شێوە لەخۆدەگرن:

١/پەیماننامە ئیلزامییە سەپێندراوەکان: لەو شێوە پەیماننامانەدا چەندین شێوە سزا و عیقاب بۆ سەرپێچیکارانی سلوکی پیشەیی دیارکراوە کە سەرزەنشتکردن و ڕاگرتن لەخۆدەگرێت.

٢/پەیماننامە ئارەزوومەندەکان: ئەو جۆرەیان لەسەر بنەمای ئارەزووی ڕۆژنامەنووسان داڕێژراوە کە سەرپشکە لە پابەنبوون پێیان و هیچ سزا و لێپێچینەوەیەك لەخۆناگرێت.

لەهەمان کاتدا پسپۆران لەسەر بنەمای جۆری هۆکانی ڕاگەیاندن و تایبەتمەنیان، چەند جۆرە پەیماننامەیەکی دیکەیان دەسنشیانکردووە کە بە لاوەکی هەژمار دەکرێن، ئەوانیش بریتین لە:

١/کۆمەڵە پەیماننامەیەکی گشتی کە سەرجەم هۆکانی ڕاگەیاندن لە بینراو و بیسترا و نووسرا و ئەلیکترۆنی لەخۆدەگرێت.

٢/کۆمەڵە پەیماننامەیەك تایبەتە بە ناوەڕۆکی پرۆسەی ڕاگەیاندن و گەیاندن وەك، فێرکردن، پێڕاگەیاندن، تەرفیە، و ڕێکلامکردن.

٣/چەند پەیماننامەیەك دەزگایەكی دیاریكراوی راگەیاندن وەك، رۆژنامە یان رادیۆ یان TV یان سایتە ئەلیكترۆنیەكان، لەخۆدەگرێت.

٤/ئەو پەیماننامانەی لایەنێكی دیاریكراو و بچووك لە پیشەسازی پەیوەندیكردن بەرزەفت دەكەن،بۆ نموونە لە رۆژنامە تەنها باس لەلایەنە ئاكارییەكانی نووسین یان رێكلامكردن یان هەواڵ یان بلاَوكردنەوەو دابەشكردن ،دەكەن.

## پەیماننامە نێو نەتەوەییەكانی ئیتیكی رۆژنامەوانی

پەیماننامەكانی شەرەف یان ئیتیكی رۆژنامەوانی لە ئێستادا هێندە جۆرا و جۆر و لق و پۆپدارن ناكرێ بەوردی دەسنیشانی كۆمەڵە بنەمایەكی گشتكیر بكەین و بڵێین ئەوانە بەهای جیهانین و سەرجەم رۆژنامەوانان قەبوڵیانە، لە هەندێك ولاَتدا بەتایبەت ئەوانەی خودان نیزامێكی پێگەیشتووی پەیوەندیكردنن زیاتر لە دە دەستگەی راگەیاندنیان هەیە،هەریەك لەوانە خاوەن كۆمەڵە بنەمایەكی ئاكاری جیاوازن لەیەكتری، راستە لە ئامنجدا لەیەكتری نزیكن بەلاَم شێوەی بەرِێوەبردن و نەزرەیان بۆ ئاكارە پیشەییەكان جیاوازە

لێرەدا، لەبەر گرنگی و بایەخی رێسا و پەیماننامە ئاكارییەكان، دەقی هەندێكیان بۆ خوێنەران دەخەینە روو:

سەرەتا بە بنەما گشتییەكانی ئیتیكی رۆژنامەوانی دەستپێدەكەین كە پسپۆران لە چەند خاڵێك كۆیان كردۆتەوە،ئەوانیش بریتین لە:

١/پێویسە رۆژنامەنووس بەر لە هەموو شتێك رێز لە كەرامەتی خۆی و پیشەكەی بگرێت.

٢/نابێ لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتدا،قەڵەمی بۆ هیچ كەس و لایەنێك بفرۆشێت.

٣/پێویستە خۆی لە ناوزراندن و تەشهیر و سوكایەتیپێكردن بە هاولاَتیان بەدوور بگرێت.

٤/دەبێ كار بۆ پاراستنی سەر و ماڵ و ئاسایشی خەڵك بكات.

٥/پێویستە راستی و دروستی هەوێنی نووسینەكانی بێ، و هەواڵی راست و دوور لە درۆ بلاَوبكاتەوە.

٦/پێویستە نهێنییە تایبەتیەكانی دوێنەر(مخاگب) بپارێزێ.

٧/نابێ ئەو ئازادییەی كە بۆی دابینكراوە خراپ بەكاربهێنێ.

٨/دەبێ لەبەرقەراركردنی ئاشتیدا رۆڵی هەبێ.

٩/نابێت بەئارەزووی خۆی و بەپێچەوانەی یاساكان كاربكات.

١٠/پێویستە لەبەرقەرارکردنی ئاشتیدا رۆڵی هەبێت.

١١/پێویستە ریز لە مافەکانی مرۆڤ بگرێ و حورمەتی کەس پێشێل نەکات.

١٢/پێویستە بەر لە بلاۆکردنەوەی هەر هەواڵێك، لە راستی و دروستی سەرچاوەی هەواڵەکە دڵنیا بێت ئینجا بلاۆی بکاتەوە.

١٣/نابێ ببێتە هۆکاری دروستبوونی پەشێوی و ناسەقامگیری لە ولاتدا.

١٤/دەبێ بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتی ببنە هەوێنی کارەکانی.

## ١/پەیماننامەی ئیتیکی یەکیەتی رۆژنامەنووسانی جیهانی

یەکیەتی رۆژنامەوانانی جیهانی ساڵی ١٩١٨ پەیماننامەیەکی هاوشێوەی سوێندنامەی پیشەیی(ئەبوکرات)ی پزیشکانی راگەیاند،کە پێویستە هەموو رۆژنامەوانێك لەرووی ئیتیکییەوە لە ئاست ئەو سوێندخواردنە دابێت.

پەیماننامەکە لەو خالانەی خوارەوە پێك دێت،رۆژنامەوان سوێند دەخوات کە:

١/لەبەرامبەر ئەو نووسینەدا کە بلاۆیدەکاتەوە تەنانەت ئەگەر بەناوی خوازراو(مستعار)یش بێ هەست بەبەرپرسیارییەتی دەکات.

٢/بوختان بەکەس ناکات و بێئەوەی بەڵگەی بەدەستەوەبێ تاوان ناداتە پاڵ هیچ کەسێك،دەستکاری بەڵگەنامە و زانیارییەکان ناکات،و درۆکردن بە گەورەترین دوژمنی پیشەیی خۆی دەزانێ.

٣/رێگە بەخۆی نادات سوود لە ناونیشان و پلە و بەرپرسیاریەتێك وەربگرێ کە نیەتی.

٤/لەبەر ئەوەی باوەڕی بەشکۆمەندی پیشەکەی هەیە،جگە لەو کار و ئەرکانەی لەگەڵ ئامانج و ئیعتیباری پیشەکەی یەکدەگرنەوە، کارێکی دیکە ناخاتە ئەستۆی خۆی.

٥/بۆبەدەستهێنانی زانیاری و هەواڵ، خۆبەدوور دەگرێ لە رێگا و شێوازی خراپ و دوور لە ئیتیکی پیشەیی.

٦/لە هیچ دامەزراوەو رێکخراو ونێوەندێکی حکومی و تایبەتی لەژێر ناوی کارەکەی هیچ پارەو یارمەتییەك وەرناگرێ ،یان ناوبانگی پیشەکەی بۆ شتی دیکە ناقۆزێتەوە.

٧/نووسین و بەرهەمی خەڵکی دیکە ناکات بەهی خۆی، گەر لە نووسینی هاوپیشەکانی سوودی وەرگرت ،ئاماژە بە ناویان دەکات.

٨/کار بۆ دەرکردن و نانبڕینی هاوپیشەکەی ناکات،یان بیر لە داگیرکردنی جێگەی هاوکارێکی ناکاتەوە بە پارە و ئیمتیازاتێکی کەمتر.

٩/نهێنییەکانی پیشەکەی دەپارێزێت.

١٠/ئازادی رۆژنامەگەری بۆ مەبەستی دزێو و خراپ بەکار ناهێنێ.

١١/بەردەوام داوای ئازادی و گەیشتن بە زانیاری و سەرچاوەکانیان دەکات.

١٢/مەبەستی سەرەکی لە پیشەکەی گەیاندنی زانیاری و راستییەکانە وەك خۆی و هێنانەدی دادپەروەرییە، بۆیە کاری خۆی لەگەڵ خەڵکی دیکە لێتێکناچێت.

## ٢/پەیماننامەی ئیتیکی نێودەوڵەتی راگەیاندن

ساڵی **١٩٥٣** لیژنە ئیعلامییە نێونەتەوەییەکان لە میانی خولی چوارەمی کۆبوونەوەکانیان بڕیاریان لەسەر کۆمەڵێك بنەمای ئاکاریدا کە ناوی (پەیماننامەی ئیتیکی نێودەوڵەتی راگەیاندن)ی لێندرا ،ئەو پەیماننامەیە لە کۆمەڵە مادەیك پێك دێت،ئەوانیش بریتین لە:

مادەی یەکەم:پێویستە کارمەندانی بواری میدیا ئەوەی لە توانایاندایە بیکەن بۆ دڵنیابوون لە راستی و دروستی ئەو زانیاری و رووداوانەی پێشکەشی وەرگر(متلقی) دەکەن، گەیاندنی هەواڵ و زانیاری هەڵە هێڵی سوورە،شێواندنی رووداو و هەواڵەکان یان شاردنەوەی راستییەکان بەدەستی ئەتقەست هەرگیز قەبووڵ نیە.

مادەی دووەم:دەبێ هەموو کات میدیاکار بەرژەوندی گشتی لەسەرووی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی دابنێ.درۆ و جنێودان و تەشهیر و تاوانبارکردنی ناڕەوا و بەبالأبەخۆدابڕینی کەسایەتی کەسێکی دیکە(الانتحال)، سەرپێچیکردنی پیشەیی ترسناکن،وەفاداری بۆ جەماوەر بنەڕەتی رۆژنامەگەری سەرکەوتووە،لەکاتی رووداني هەر هەڵە و بلاْوکردنەوەی هەواڵێکی نادروست،پێویستە رۆژنامەنووس یان دەزگاکە یەکسەر و بێ دواکەوتن هەڵەکە راستبکاتەوە،یان پۆزش بهێنێتەوە.

مادەی سێهەم: پێویستە کارمەندانی راگەیاندن تەنها ئەو جۆرە ئیش و کارەیان پێبسپێردرێ کە یەکانگیرن لە گەڵ ئەرك و وەزیفەی راگەیاندن ،ناکرێ رۆژنامەنووس کارێکی وای لێداوابکرێ کە لەگەڵ کارەکەی لێکنەداتەوە،لەکاتی بلاْوکردنەوەی هەر زانیارییەکی کەسی دەبێ بەشێوەیەك بلاْویان بکاتەوە کە خزمەت بە پرسێکی گشتی بگەیەنێ،نەك زیان لە سومعە

و پێگەی کەسەکە بدات،پێویستە رۆژنامەنووس نهێنی سەرچاوەکانی زانیاری بپارێزێ و ئاشکرایان نەکات.

ماددەی چوارەم:پێویستە ئەو راگەیاندنکارانەی بایەخ بە رووداوەکانی وڵاتێکی دیارکراو دەدەن، یان کۆمیت و وتار دەربارەی دەنووسن،زانیاری ورد و تەواویان دەربارەی لاینە جۆربەجۆرەکانی ئەو وڵاتە هەبێ.

ماددەی پێنجەم:پارێزگاریکردن لە بەها ئاکارییەکانی ئەو پەیماننامەیە دەکەوێتە ئەستۆی کارمەندانی راگەیاندن و رۆژنامەنووسان نەك ئەستۆی حکومەت،بۆیە نابێ بنەماکانی ئەو پەیماننامەیە وەك دەستێوەردان لە کاروباری میدیا تەماشا بکرێت.

## ٣/پەیماننامەی شەرەفی فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی رۆژنامەنووسان

ئەو پەیماننامەیە ساڵی ١٩٥٤ لەلایەن ئەنجوومەنی جیهانی فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی رۆژنامەنووسانەوە راگەیاندرا،ساڵی ١٩٨٦ لەلایەن هەمان ئەنجوومەنەوە هەموار کرایەوە،ئەم راگەیاندراوە وەك پێوەرێکی جیهانی دادەندرێت بۆ رێکخستنی ئەرکە پیشەییەکانی رۆژنامەنووسان،بنەما سەرەکییەکانی بریتین لە:

١/یەکەمین ئەرکی رۆژنامەنووس رێزگرتنە لە راستی و مافی جەماوەر بۆ گەیشتن بە راستییەکان.

٢/رۆژنامەنووس لەمیانی کارەکەیدا داکۆکی لە ئازادییەکان دەکات،هەروەها مافی رادەربڕین و رەخنەگرتنی هەیە بەشێوەیەکی بەرپرسانە.

٣/دەبێ رۆژنامەنووس بۆ وەدەستهێنانی هەواڵ و زانیاری و وێنە و بەڵگەنامە،رێگای دروست و رەوا بگرێتەبەر.

٤/نابێ رۆژنامەنووس زانیاری گرنگ بشارێتەوە،یان بەڵگەنامەکان بشێوێنێت،هەروەها تەنها ئەو هەواڵانە بلاودەکاتەوە کە تەواو لە راستی و دروستیان دڵنیایە.

٥/پێویستە رۆژنامەنووس پارێزگاری لە نهێنییەکانی پیشەکەی بکات،و سەرچاوەی ئەو زانیارییانە بپارێزێ کە داوای لێکراوە نەیاندرکێنێ.

٦/دەبێ رۆژنامەنووس بەئاگا بێ لەو مەترسییانەی کە لەوانەیە بەهۆی جیاکاری و ناکۆکییەوە لە نێوان دەزگاکانی راگەیاندن رووبدات،پێویستە تواناکانی بخاتە گەڕ بۆ رێگرتن لە

هەر زانیاری و بانگەشەیەك كە ببێتە مایەی جیاكاری و رەگەزپەرستی زمان و ئایین و بیروباوەڕی سیاسی.

٧/لەكاتی بڵاوكردنەوەی هەر زانیارییەكی نادروست،پێویستە رۆژنامەنووس هەرزوو هەوڵی راستكردنەوەی هەڵەكەی بدات.

٨/گرنگە رۆژنامەنووس بزانێ كە هەندێ كار و رەفتار مانای سنووربەزاندنی پیشەكەیەتی،لەوانە:بوختان،تەشهیر،ساختەكاری،تانە و تۆمەتی بێ بنەما،بەرتیل وەرگرتن ،و شاردنەوەی زانیاری .

٩/ئەو رۆژنامەنووسانەی كە بەهەق خۆیان بە رۆژنامەنووس دەزانن و هەڵگری پەیامی راستەقینەی پیشەكەیانن،دەبێ لە كاتی بەجێگەیاندنی پیشەكەیاندا رەچاوەی ئەو پرەنسیپانە بكەن لە چوارچێوەی یاسا گشتییەكانی وڵاتدا.

٤/پەیماننامەكەی رێكخراوی( یونیسكۆ) دەربارەی دەزگاكانی راگەیاندن

لە بنەڕەتدا بنەماكانی ئەو پەیماننامەیە هەڵێنجراوی دیدگا و پێشنییارەكانی وڵاتانی بێلایەن و جیهانی سێهەم و چەند وڵاتێكی دیكەی ئاسیاوی و ئەفریكییە دەرباری دەزگاكانی راگەیاندن، ئەم وڵاتانە بۆ بەرپەرچدانەوەی زاڵبوون و باڵادەستی و قۆرخكردنی میدیا لەلایەن نیزامی سەرمایەدارییەوە ،چەند رێكار و پێشنیارێكیان خستەڕوو،رێكخراوی یونسكۆش لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٨ز زۆرینەی پێشنیار و رێكارەكانی ئەو وڵاتانەی تەبەنیكرد، لەگەڵ ئیزافەكردنی چەند بنەمایەكی دیكە.

## پەیماننامەكەی یونیسكۆ(١١) ماددەی بنەڕەتی لەخۆدەگرێت ئەوانیش:

**ماددەی یەكەم**:چەسپاندنی ئاشتی و بنەماكانی مافی مرۆڤ و بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی رەگەزپەرستی و رومالكردنی رووداوەكانی جەنگ،پێویستی بە ئازادی رادەربڕین و وەدەستهێنانی زانیاری و هەواڵ و بڵاوكردنەوەی هەیە.

**ماددەی دووەم**:مومارەسەكردنی ئازادی رادەربڕین و میدیا بەشێكی نەپچڕاوەی مافەكانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەكانە.

لەپێناو پێشكەشكردنی زانیاری و هەواڵ بەجەماوەر تا بەهۆیانەوە ئاگاداری و زانیاری پێویستی دەربارەی دەروبەر و دونیا هەبێ،پێویستە ئازادی تەواو بۆ میدیاكاران فەراهەم بكرێ،و ئازادبن لە ناردنی راپۆرت و هەواڵەكانیان بۆ ئاژانس و نێوەندە میدیاییەكان.دەبێ بارودۆخی

شیاوی کارکردنیش بۆ رۆژنامەوانان دەسەبەربکرێ تا بەبێ هیچ رێگری و گرفتێك ئەدای کارەکەیان بکەن.

**ماددەی سێهەم**:هۆکانی راگەیاندن لەرێگەی بلاّوکردنەوەی راپۆرت و هەواڵ و زانیاری دەربارەی شێوەی ژیان و پێداویستی و کێشە و هیوا و ئاواتی نەتەوە جیاجیاکان، دەتوانن بە کردار بەشداربن لە لەناوبردنی نەخوێندەواری و رەگەزپەرستی و هەژاری،هاوکات رۆڵیان لە بەهاناوەهاتنی نەتەوە هەژار و کەمدەرامەتەکانیش دەبێ،لەهەمان کاتدا دەبنە هۆکاری کەمکردنەوەی گرژی و ململانێی نێوان دەوڵەت و میللەتان.

**ماددەی چوارەم**:پێویستە هۆکانی راگەیاندن رۆڵی بەرچاو لە چاندنی رۆحی دادپەروەری و یەکسانی و سەربەخۆی و ئازادی لە ناخی گەنجان بگێڕن، کە دەرئەنجام ئیجابیانە بەسەر پەرەپێدانی سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی کۆمەڵگە دەشکێتەوە.

**ماددەی پێنجەم**:دەبێ میدیا سەرجەم بیرورِا دژبەیەکەکان بخاتەڕوو و بەیەك چاو تەماشای هەموو لایەك بکات،مەودایەکی فراوان بۆ راو رای جیاواز فەراهم بکات.رێگە بەوانە بدات کە هەواڵ و زانیارییان لەسەر بلاّودەکاتەوە،ئەوانیش بەرگری لەخۆیان بکەن و بەڵگە یان بیروبۆچوونەکانیان بخەنەڕوو.

**ماددەی شەشەم**:لەپێناو زامنی گەیشتنی زانیاری و هەواڵ بەدەستی هەمووولایەك،بەتایبەت میدیای ولاّتانی تازە پێگەیشتوو ،و سڕینەوەی مۆرکی جیاکاری لەنێوان ئەو ولاّتانەو ولاّتانی پێشکەوتوو،پێویستە ئەو ولاّتانە و رێکخراوە نێونەتەوەییەکان یارمەتی ولاّتانی تازەپێگەیشتوو بدەن لە بواری میدیا و بەدەستهێنانی زانیاری، تا مەحروم نەبن لە پێشکەوتن و گەیاندنی زانیاری بە جەماوەری خۆیان.

**ماددەی حەفتەم**:پێویستە لەسەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی کار بۆ رەخساندنی بارودۆخێکی شیاوی ئازادی رادەربڕین و بلاّوکردنەوەی هەواڵ و دەسەبەرکردنی زانیاری بۆ هەموو لایەك بکات،لەگەڵ داکۆکیکردن لە رۆژنامەوانان و سەرجەم کارمەندانی دیکەی راگەیاندن.

**ماددەی هەشتەم**:کار بۆ فراوانکردنی پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی رۆشنبیری و زانیاری نێوان دەزگاکانی راگەیاندن و ولاّتان بکرێت،بەتایبەت لە نێوان ئەوانەی کە نیزامی ئابووری و کۆمەلاّیەتی و سیاسیان جیاوازە.

**ماددەی نۆیەم**:پێویستە رێکخراوە پیشەییەکان و کەسانی چالاك لە بواری میدیا، بەتایبەت ئەوانەی راهێنان و گەشەپێدان بۆ میدیاکاران دەکەن،بایەخی تایبەتی بەو بنەما ئاکارییانە بدەن و لەکاتی کارکردنیان بەوردی لەبەرچاویان بگرن.

ماددەی دەیەم:بۆ ئەوەی کۆمەڵگە ببێتە خودان دامودەزگای رۆژنامەوانی ئەکتیڤ و کاریگەر ،پێویستە سەرجەم ولآتانی ئەندام لە رێکخراوەکەمان شانبەشانی یاسا و تەشریعاتە نێوخۆییەکان بەجدی کار بۆ جێبەجێکردن و چەسپاندنی ئەو پرەنسیپانە بکەن.

## بەشی دووەم

### یەکەم:پەیماننامەی شەرەفی رۆژنامەنووسانی هەرێمی کوردستان

ئەگەرچی تەمەنی رۆژنامەگەری کوردی زیاتر لە سەدەیەکە و سەرەتاکانی بۆ ساڵی ١٨٩٨ز دەگەڕێتەوە،ئەوکاتەی یەکەمین رۆژنامەی کوردی لەسەر دەستی میقداد مەدحەت بەدرخان لە قاهیرەی پایتەختی میسر هاتە لەدایکبوون،کەچی هێشتا رۆژنامەگەری کوردی رۆژنامەگەرییەکی ئەماتۆری ناپیشەگەرە،فاکتەرەکانی ناپیشەگەری رۆژنامەگەری کوردی جۆراوجۆرن،هەرە دیار و کاریگەرەکەیان نەبوونی کیانی سیاسی کوردییە،رۆژنامەگەری کوردی لەم پارچەیەی باشووری کوردستان و سەرجەم پارچەکانی دیکەدا بەشێوەیەکی گشتی بەشێك بووە لە رۆژنامەگەری وڵاتە کۆلۆنیاڵەکانی کوردستاندا،داگیرکارانی کوردستان بەهیچ شێوەیەك رێگەیان نەداوە رۆژنامەنووسانی کورد لەیەك رێکخراوی پیشەیی کوردی سەربەخۆدا کۆببنەوە،بەڵکە هەموو هەوڵ و کۆششێکیان پەراوێزخستنی رۆژنامەوانانی کورد و پاشکۆکردنیان بووە بە سەندیکا رۆژنامەوانییە عێراقی و تورکی و سوری و ئێرانییەکان.

فاکتەرێکی دیکەی ئەماتۆریەتی رۆژنامەگەری کوردی،هەمدیس پەیوەندارە بە کۆلۆنیالکردنی کوردستانەوە ،داگیرکارانی کوردستان بەدەستی ئەنقەست رێگەیان نەداوە لە زانکۆکانی کوردستان کۆلیژ و پەیمانگای رۆژنامەگەری دابمەزرێت،هەروەها رێگریشیان لە قوتابیانی کورد کردووە پەیوەندی بە بەشەکانی رۆژنامەگەری لە زانکۆکانی دەرەوەی کوردستان بکەن،ئەم دوو فاکتەرە خاڵی سەرەکی ناپیشەگەری و نا سیستماکی رۆژنامەنووس و دەزگاکانی راگەیاندنی کوردین،لە کوردستانی باشوور دوای سەربەخۆبوونی ئەو پارچەیە لەنەوەدەکانیسەدەی رابردوو، کاریگەرییەکانی ئەو بارودۆخە بەروونی بەدیارکەوتن،بەتایبەت پاش دامەزراندنی دەیان رۆژنامە و گۆڤار و هەفتەنامە و رادیۆ و **tv** لۆکاڵ و ئاسمانی،

پێداویستی بواری رۆژنامەگەری بۆ بە ئەکادیمیکردنی کادیران و دامەزراندنی سەندیکای پیشەیی داکۆکیکار لە مافەکانیان ئەو کاتە بوو بە زەروورەت کە دامودەزگا رۆژنامەوانییە کوردستانییەکان رووەو فراوانبوون چوون،و بەروونی هەست بە کەلێن و کەموکوڕی لە رۆژنامە و رادیۆ و tvکرا،بەگشتی کەموکورییەکان لەوەوە سەرچاوەیان دەگرن کە زۆرینەی کادیرانی راگەیاندن کەم ئەزموونن لە کاری رۆژنامەوانی بەمانا زانستییەکەی، و لە دونیای ئەدەبەوە هاتوونەتە جیهانی رۆژنامەوانی،بێگومان ئەمەیش تەحەدایەکی جیدییە لەهەمبەر مەسەلەی ئیتیك و رەچاوکردنی بەها ئاکارییەکانی پیشەی رۆژنامەوانی لە هەرێمی کوردستاندا.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٨ رۆژنامەگەری کوردی رووداوێکی مێژووی گرنگی بەخۆوە بینی ئەویش راگەیاندنی یەکەمین سەندیکای رۆژنامەنووسان بوو لە مێژووی راگەیاندنی کوردیدا،سەندیکای رۆژنامەنووسان سەرباری کەموکورتییەکانی، و وێڕای ئەو رەخنە و گلەییانەی ئاڕاستەی دەکرێن،دەستکەوتێکی مێژووییە،بەو پێیەی تاڕادەیەك گەر دیاریکراویش بێ توانیویەتی داکۆکی لە مافە پیشەییەکانی ئەندامانی بکات.وەك لەتەجرەبەی وڵاتانی دیکەدا بینیمان زۆرینەی پەیماننامە یان شەرەفنامەکانی ئەخلاقی رۆژنامەوانی لە منداڵدانی ئەنجوومەن یان کۆمەڵە یان سەندیکا رۆژنامەوانییەکانەوە لەدایك بوون،وەلێ لە کوردستانی باشووردا ئەمە دووبارە نەبوەوە،و راگەیاندنی پەیماننامەی شەرەف زۆر دوا کەوت،تا ئەوەی چەند ساڵێك بەر لە ئێستا بەدەسپێشخەری کۆمەڵ رۆژنامەنوسێك پەیماننامەی شەرەفی رۆژنامەنووسانی کوردستان راگەیەندرا و سەندیکای رۆژنامەنووسانیش پەسندی کرد،ئێستا بواری رۆژنامەوانی کوردی خاوەن یەك پەیماننامەی شەرەفە لەکاتێکدا بەڕای ئێمە پێویستە هەر دەزگایەکی رۆژنامەوانی خودان پەیماننامەی شەرەفی خۆی بێت،وەك ئەوەی لە وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا دەبیندرێت.

هەرچۆنێك بێ بوونی ئەو پەیماننامە کوردستانیە لەنەبوونی باشترە و جێگەی دەسخۆشییە،لەگەڵ ئەوەی تانووکە (بەپێی زانیاری من)زانیاری و ئاگایی رۆژنامەنووسانی کوردستان دەربارەی لە ئاستێکی نزمدایە،بنەماکانی پەیماننامەی شەرەفی رۆژنامەنووسانی کوردستان ئەم خاڵانەی خوارەوە لەخۆدەگرێت:

١/رۆژنامەنووس لەمیانی پەیڕەوکردنی کارەکەیدا رەچاوی بەرپرسیاریەتی دەکات،کە پەیامەکەی بەرامبەر کۆمەڵگە خستوویەتیە ئەستۆ.

٢/رۆژنامەنووس لە گەیاندنی هەواڵ و زانیاریدا راستگۆ دەبێت و وردبینی زۆر بەکار دەهێنێت،لەپێناو سەبقی رۆژنامەوانی و وروژاندنی شەقام و زیادکردنی تیراژ و بازارپەیداکردندا،متمانەی خۆی بەرامبەر وەرگر لەدەست نادات.

٣/رۆژنامەنووس لە دارِشتنی هەواڵ و پێشکەشکردنی زانیاریدا،سەربەخۆیی خۆی دەپارێزێت.

٤/رۆژنامەنووس داکۆکی لە ئازادی دەکات و لە بەدەستهێنانی داتا و زانیاریدا ئازا دەبێت و ئە و ئازایەتییەش لە رادەربڕیندا دواجار بۆ بەدەستهێنای ئازادی رادەربڕین بەکاردێنێت.

٥/رۆژنامەنووس بۆ مەرامی دزێو و بەرژەوەندی تایبەت،سوود لە ئازادی رادەربڕین و مافی رەخنەگرتن وەرناگرێت.

٦/رۆژنامەنووس لە دارِشتن و بلاّوکردنەوەدا بێلایەنی پیشەیی دەپارێزێت و جیاکاری لە نێوان بابەت و رووداوەکاندا ناکات.

٧/رۆژنامەنووس سەرچاوەکانی هەواڵ ئاشکراناکات و نهێنیپارێز دەبێت.

٨/رۆژنامەنووس لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجی گەورەی ئیتیکیدا،هەوڵی بەدەستهێنانی هەواڵ و زانیاری و وێنەو بەڵگەنامە دەدات.

٩/رۆژنامەنووس لە رومالّکردنی رووداو و گواستنەوەی زانیارییەکاندا دەستپاك و سەرراست دەبێت و دڵنیایی و بابەتیبوون لەبەرچاو دەگرێت و زانیاری گرنگ ناشارێتەوە،بەڵگەنامەکان ناشێوێنێت و بابەتی رۆژنامەوانی دیکە ناکات بەهی خۆی و لەکات و شوێنی پێویستدا ئاماژە بەناوی سەرچاوەکە دەکات.

١٠/رۆژنامەنووس هەوڵی جیددی دەدات بۆ راستکردنەوەی ئەو زانیاریانەی بەشێوەیەکی نادروست بلاّوکراونەتەوە و زیان بە بەرژەوەندی گشتی دەگەیەنن،هەروەك مافی روونکردنەوە و وەلاّمدانەوەش بۆ ئەو کەس و لایەن و گروپ و دەزگایانەش دەستەبەردەکات کە پێیان وایە لە میانی بابەتێکەوە زیان بەناوبانگیان گەیشتووە،یان زانیاری نێو بابەتێك لەبارەیانەوە هەڵەی تێدابووە.

١١/رۆژنامەنووس تایبەتبوونی ژیانی کەسەکان رەچاو دەکات.

١٢/رۆژنامەنووس دادوەرانە مامەڵە لەگەڵ ماددە رۆژنامەنووسییەکان دەکات و هەوڵنادات حەزی ئەنجامدان یان دووبارەکردنەوەی تاوان و توندوتیژی و کاری دزێو لای وەرگر دروست و گەورە بکات.

١٣/رۆژنامەنووس پیشەو ناسنامەکەی لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتدا بەکار ناهێنێت و ساختەکاری ناکات،وەك چۆن هەموو بەرتیل،دیاری،بانگهێشتێك کە نێگەتیڤانە کاربکاتە سەر کارەکەی قەبوڵ ناکات و لەرێگەی پیشەکەیەوە هاوکاری دەزگایەکی سیخوڕی،یان لایەنێك ناکات دژی لایەنێکی دیکە،بەجۆرێ کاربکاتە سەر بەرژەوەندی گشتی.

١٤/رۆژنامەنووس رێز لە راستی و پرەنسیپی مافی زانین و مافی خەڵك لە گەیشتن بەزانیارییەکان و هەموو دیدو ئاراستە جیاوازەکانی کارکردن و بیرکردنەوە دەگرێت و مافی دەربڕینیشیان بەبێ جیاوازی بۆ فەراهم دەکات.

١٥/رۆژنامەنووس مافەکانی مرۆڤ و بەها مرۆییەکان دەپارێزێت و هەوڵی قوڵکردنەوەی گیانی دیموکراسی و ،سەروەری یاسا و لێبوردەیی و تەبایی و پێکەوەژیان و پێشکەوتن و بەرژەوەندی گشتی دەدات.

١٦/رۆژنامەنووس هەرگیز بیر لە وەرگرتنی پۆستی هاوکارێکی ناکاتەوە،یان ئەو جێگەیە بەمەرجێکی کەمتر وەرناگرێت و رێگە بۆ دەرکردنی هاوپیشەکەی خۆشناکات.

١٧/رۆژنامەنووس رەچاوی ئەو پرەنسیپە یاساییە دەکات کە دەڵێت:((تۆمەتبار بێتاوانە تا ئەوکاتەی تۆمەتەکەی لە دادگا دەسەلمێندرێ))

١٨/رۆژنامەنووس کار لەسەر هەست و سۆزی وەرگر ناکات و لە رووداو و بابەتە جیاوازەکاندا چەواشەیان ناکات.

## دووەم:چەند نموونەیەك لە پەیماننامە نێوخۆییەکانی وڵاتان دەربارەی ئیتیکی رۆژنامەوانی

لە ئێستادا زۆرینەی وڵاتان،بەتایبەت ئەوانەی خاوەن میدیای پێگەیشتوو و نیزامی ئیعلامی پێشکەوتوون،خودان پەیماننامەی ئیتیکی تایبەت بەخۆیانن کە شان بەشانی یاساکانی رۆژنامەوانی کاری راگەیاندن رێکدەخەن، و رێنمایی رۆژنامەوانانیش دەکەن لە ئەرك ومافەکانیان،ئێمە لێرەدا سێ نموونە لەو پەیماننامانە کە یەکێکیان ئەمریکی و ئەویدیکەیان ئەوروپی و سێهەمیشیان عەرەبییە دەخەینەروو،لەگەڵ تیشکخستنە سەر پەیماننامەی شەرەفی رۆژنامەنووسانی کوردستان و پرسی ئیتیك لە میدیای کوردیدا.

١/پەیماننامەکانی شەرەفی راگەیاندن لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

شەرەفنامەکانی ڕاگەیاندن لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە منداڵدانی ئەو ئەنجوومەن و سەندیکا و ڕێکخراوە ڕۆژنامەوانییانە هاتنە لەدایك بوون کە داکۆکیان لە مافی ڕۆژنامەوان و ئازادی میدیا دەکرد،ئامانجی سەرەکی ئەو نێوەندانە لە ڕاگەیاندنی پەیماننامەکانی ڕاگەیاندن پابەندبوونی ئارەزوومەندانەی میدیاکارانە بە کۆمەڵە بنەمایەکی کۆمەلایەتی و ئەخلاقی و پیشەی پەیوەست بە کاری ڕۆژنامەوانی ، لە بری سەپاندنی ڕێکار و ڕێنمایی بەزۆرەملی بەسەریاندا.

ڕێکخراو و دەستە ڕۆژنامەوانییە بەشداربووەکان لە ڕاگەیاندنی پەیماننامەکانی شەرەف لە ئەمریکا زۆر و جۆراو جۆرن،بەلام هەرە دیارترین و گرنگترینیان کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانە پیشەگەرەکان، و ڕێکخراوی کۆمەڵگەی ئەمریکی بۆ نووسەرە ڕۆژنامەوانەکان ،و یەکیەتی بەڕێوەبەرانی هەواڵە لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکانە،لێرەدا لەبەر گرنگی پەیماننامەی شەرەفی (کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسە پیشەگەرەکانی ئەمریکا)بە درێژی تیشك دەخەینە سەر بنەماکانی.

پەیماننامە ئاکارییەکەی کۆمەڵی نێوبراو بریتیە لە:دەستورێکی ئەخلاقی بۆ ڕۆژنامەنووسانی ئەمریکا،زۆرجار بە(سیمادەلتا کای)ناودەبرێت،ئامانجی ئەو پەیماننامەیە پێشکەشکردنی کۆمەڵێك بنەما و ڕێنماییە بە ڕۆژنامەوانان دەربارەی ئەو بەرپرسیارییەتیە ئەخلاقیەی لەکاتی ڕاپەڕاندنی کارەکانیان دەکەوێتە ئەستۆیان،نەك سەپاندنی ڕێکار و ڕێسا بەسەریاندا،هاوکات جەخت لەسەر مافی گەیشتنی ڕۆژنامەنووسانیش دەکات بە سەرچاوەکانی هەواڵ و زانیاری،ئەم دەستوورە ئاکارییە لە پێنج ماددە یان بنەمای سەرەکی پێکدێت ئەوانیش:

**یەکەم**:بەرپرسیاریەتی:مافی جەماوەر بۆ زانینی ئەو ڕوودا و هەوالانەی کە بایەخی گشتیان هەیە، یان پەیوەندارن بە بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە،ئەرك و وەزیفەی یەکەمی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکانە،چونکە ئامانج لە بلاوکردنەوی هەواڵ، ڕۆشنفیکرکرددنی ڕای گشتییە،بۆیە ئەو ڕۆژنامەوانانەی سەرپێچی بنەماکانی وەدەستهێنانی هەواڵ و بلاوکردنەوەی دەکەن لە پێناو بەرژەوەندی خودی، یان بەرژەوەندی کەسانێکی دیاریکراو،ئەوا وەك خیانەتکار بەرامبەر ڕای گشتی و پیشەکەیان هەژمار دەکرێن.

**دووەم**:ئازادی ڕۆژنامەوانی:ئازادی ڕۆژنامەوانی لە کۆمەڵگە ئازادەکاندا وەك مافێکی سەرەکی لە مافەکانی کۆمەڵگە دادەندرێت و نابێ دەسدرێژی بکرێتە سەر،ئەم جۆرە ئازادییە ڕەها و بێ سنور نیە،بەڵکە گرێدراوی بەرپرسیارییەتە.

**سێهەم**:وردبینی و بابەتیەت:کرۆك و ماهیەتی رۆژنامەگەری وەدەسهێنانی متمانە و باوەڕی جەماوەرە،لەو گۆشەنیگایەی کە:

١/راستگۆیی ئامانج و مەبەستی هەموو دەزگایەکی رۆژنامەوانیە.

٢/بابەتیەت و بێلایەنی لە نووسینی هەواڵدا،پێودانگی سەرەکی هەڵسەنگاندنی رۆژنامەنووسە.

٣/ لەکاتی بلاۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری نادروست یان هەڵەدا، هیچ پاساو و بیانوییەك مەقبول نیە.

٤/پێویستە مانشێتە سەرەکیەکان هاوکۆك بن لەگەڵ ناوەرۆکی وتار و نووسینە رۆژنامەوانیەکانی دیکەدا،دەبێ وێنە پەخشکراوەکانی **tv** کوزارشتی راستەقینە لە رووداوەکان بکەن،و نابێ لە قەبارەی راستەقینەی خۆیان گەورەتر نیشانیان بدەن.

٥/دەبێ رۆژنامەنووس جیاوازی بکات لە نێوان هەواڵ و راپۆرتە هەواڵەکان، و رادەربڕیندا،پێویستە راپۆرتە هەواڵەکان تەواو دوور بن لە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی رادەربڕین،و سەرجەم لایەنەکانی رووداوەکە وەك خۆی بخەنەڕوو.

٦/لە وتاری رۆژنامەوانیدا رۆژنامەنووس دەتوانێ تەعبیر لە را و بیروبۆچوونەکانی بکات،بەلاٌم نابێ دەربڕینەکانی دژ بە واقیع و راستییەکان بێ.

٧/لەکاتی نووسینی وتار یان بەشەکانی دیکەی نووسیندا،رۆژنامەنووس بەرپرسیياريەتیکی پیشەیی لە ئەستۆدایە،دەبێ بەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ خستنەڕووی هەواڵ و رووداوەکان بکات.

٨/لەو وتارانەی کە رۆژنامەنووس راو و بۆچوونەکانی دەخاتەروو،یان شرۆڤەی واقیع و رووداوەکان دەکات،پێویستە مانشێتەکانی هێندە روون و ئاسان بن خوێنەر هەر لەگەڵ بینیان هەست بکات کە ئەو وتارانە وتاری رادەربڕن و شرۆڤەکارین.

**چوارەم**:رێزگرتن:پێویستە رۆژنامەنووسان لەکاتی کۆکردنەوەی هەواڵدا رێز لە کەرامەت و تایبەتمەندی و مافی ئەوانە بگرن کە زانیاریان لێوەردەگرن،ئەمەیش لەرێگەی رەچاوکردنی ئەم خالاٌنەی خوارەوە:

١/نابێ هۆکانی راگەیاندن تۆمەتی نافەرمی بلاۆبکەنەوە کە دەبێتە هۆی ناوزڕاندنی کەرامەت و ناوناوبانگی کەسی تۆمەتبار، و بێ ئەوەی دەرفەتی رەتدانەوەشی بۆ برەخسێنن.

٢/نابێ میدیا وردەکاری نەشیاو دەربارەی بابەتەکانی پەیوەست بە تاوانەکانی لەشفرۆشی و کوشتن بلاۆبکاتەوە،بەتایبەت ئەو وردەکاریانەی لەگەڵ دابی گشتی یەکناگرنەوە.

٣/نابێ دامودەزگاکانی راگەیاندن دەسدرێژی بکەنە سەر مافی ئەوانەی حەزدەکەن پارێزگاری لە ژیانی تایبەتیان بکەن ،و نایانەوێ هەواڵە تایبەتییەکانیان بلاْوبکەنەوە.

٤/پێویستە هۆکانی راگەیاندن لە حاڵەتی روودانی هەر هەڵەیەکدا،یەکراست و خێرا پۆزش بێننەوە و هەڵەکەیان راستبکەنەوە.

٥/رۆژنامەنووسان بەرپرسیارن بەرامبەر بە جەماوەر دەربارەی ئەو هەواڵ و راپۆرت و وتارانەی بلاْویدەکەنەوە،هاوکات دەبێ هانی جەماوەریش بدرێ لەکاتی سنووربەزاندنی بەها گشتییەکان،سکالاْی یاسایی دژی هۆکانی راگەیاندن تۆماربکەن.

**پێنجەم**:پەیمان:پێویستە سەرجەم رۆژنامەوانانی ئەمریکا تەواو پابەندی ئەو بناما ئاکارییانە بن و هانی جێبەجێکردنیشی بدەن،چونکە پابەندبوون بەو پەیماننامەیە زامنی بەردەوامی رایەڵەی باوەڕبوون و رێزگرتنە لە نێوان رۆژنامەوانان و گەلی ئەمریکا.

بە پشتبەستن بەو پێنج ماددە دەستووریەش(کۆمەڵەی رۆژنامەنووسە پیشەگەرەکانی ئەمریکا)داوا لە رۆژنامەنووسانی ئەمریکا دەکات پابەندی ئەو بنەما ئیتیکیانەی خوارەوە بن:

١/دیاری و موجامەلات و مەرایی و گەشت و هەر شتێکی دیکەی بەخۆڕایی پێشکەشکرا و بە رۆژنامەوانان،بۆی هەیە کار لە ئەمانەت و بێلایەنی رۆژنامەنووس و رۆژنامەکەی بکات،بۆیە نابێ رۆژنامەنووس هیچ شتێك قەبووڵ بکات کە بەخۆڕایی و بێ بەرامبەر بێ.

٢/پێویستە رۆژنامەنووس خۆی لە دوو وەزیفەیی و بەشداریکردن لە چالاکی سیاسی و رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و دامەزراندن لە هەر پۆستێکی گشتی بپارێزێت،پێویستە ژیانی تایبەتی خۆی بەشێوەك بەڕێوەببات ناکۆك نەبێ لەگەڵ بەرژەوەندییە گشتییەکان،هەروەها دەشبێ بزانێ کە بەرپرسیارییەتیان بەرامبەر بەجەماوەر ئەولەویەتی کارەکەیانە.

٣/ئەو هەوالاْنەی رۆژنامەنووس لە سەرچاوە تایبەتییەکانیەوە بەدەستی دێنێ،پێویستە بلاْویان نەکاتەوە تا تەواو لە راستی و دروستیان دڵنیا نەبەێ.

٤/پێویستە رۆژنامەوانان بەدوای ئەو هەوالاْنەدا بگەڕێن کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە دەکەن،دەبێ ئەو بەڵگەنامانەی لە راپۆرت و هەواڵەکاندا پشتیپێدەبەستن، بەکراوەیی بیخەنە بەر دیدی خوێنەران.

٥/دەبێ رۆژنامەنووس پابەندی ئەو بنەما ئەخلاقیە بێ کە دەڵێت:مافی رۆژنامەوانە پارێزگاری لە سەرچاوەی زانیارییەکانی بکات بەتایبەت گەر هاتوو سەرچاوەی زانیارییەکە نهێنی بێت.

٢/پەیماننامەی شەرەفی راگەیاندن لە وڵاتی سوید

وەك لە بەشەکانی پێشوو ئاماژەمان پێدا وڵاتی سوید نەك تەنها لەسەر ئاستی وڵاتانی ئەوروپا بەڵکە لەسەر ئاستی جیهاندا دەستپێشخەربوو لە راگەیاندنی بەها ئاکارییەکانی کاری راگەیاندن،سەر و کاری سوید لەگەڵ مەسەلەی ئیتیك بۆ سەرەتاکانی سەدەی رابردوو دەگەڕێتەوە،سەرباری زۆری و جۆراو جۆری پەیماننامەکانی شەرەف لەو وڵاتە،وەلێ چەند ساڵێك پێش ئێستا سەندیکای رۆژنامەنووسانی سوید، و کۆمەڵەی خاوەن ئیمتیازی رۆژنامەکان، و کۆمپانیای رادیۆ و تەلەڤزیۆنەکان،دەربارەی ئەخلاقی رۆژنامەنووسی لەسەر ئەم کۆمەڵە خاڵە رێککەوتوون:

١/بۆ ئەوەی راگەیاندن بەرۆڵی راستەقینەی خۆی هەڵسێ،پێویستە راستگۆ بێ لە گەیاندی رووداو و هەواڵەکان.

٢/دەبێ مانشێتی بابەتە رۆژنامەوانییەکان رەنگدانەوەی هەواڵ و نووسینەکان بێ و گوزارشتیان لێبکات.

٣/دەنگ و باس و هەواڵە نادروستە بلاوکراوەکان بەخێرایی راستبکرێنەوە.

٤/پێویستە رۆژنامەنووس بە رەخنە و گومانەوە سەیری سەرچاوەکانی هەواڵ بکات، تا ئەو کاتەی لێیان دڵنیا دەبێ،لەکاتی نووسینی هەواڵێکی دووبارەدا دەبێ هەوڵ بدات لە رووی دارِشتنەوە جیاواز بێ لەوانی دیکە، و شوێنپەنجەی ئیسلوبی بەسەر هەواڵەکەوە دیار بێ.

٥/لەو هەوالانەی باس لە خۆکوشتن یان هەوڵەکانی خۆکوشتنی کەسێك دەکەن،رۆژنامەنووس بۆ رێزگرتن لە هەست و شعوری خزم و کەسی ئەو کەسە دەبێ خۆی لە ناو هێنانی کەسەکە بگرێ و بلاوینەکاتەوە.

٦/دەبێ میدیاکار بە وردی لەو دیکۆمێنت و داتایانە بکۆڵێتەوە کە بەکاریان دێنێت،تا دڵنیا بێ لەوەی دژی هیچ کەسێك بەکارناهێندرێن.

٧/ئەو رەخنانەی لە دەزگاکەت دەگیرێ لەسەر بلاوکردنەوەی هەواڵی هەڵە،خێرا و بێ دواکەوتن لە رۆژنامە یان تەلەڤزیۆنەکەت بلاویبکەوە.

٨/نابێ ڕۆژنامەنووس ئەو هەواڵ و زانیارییانە بڵاوبکاتەوە کە تایبەتن بە ژیانی تایبەتی خەڵکی،بەتایبەت ئەگەر هەواڵەکە پەیوەندی بە کاری کەسەکەوە نەبێ، یان لەکاتی پشودانی فەرمی بێت.

٩/لەکاتی نووسیندا پێویستە ڕۆژنامەنووس ڕێزی تایبەت بەرامبەر ئەوانە نیشان بدات کە تۆمەتبارن،هەوڵبدات وێنەی تاوانبارەکە لەگەڵ ناوەکەی بڵاونەکاتەوە.

١٠/نابێ ڕەگەز،ئایین،نەتەوە،پیشە،ئینتیمای سیاسی تۆمەتباران بڵاوبکرێتەوە.

١١/پێویستە ڕۆژنامەنووس هەموو کات ئەوەی لەبەرچاو بێ کە کەسی تۆمەتبار بێتاوانە تا ئەو کاتەی دادگا تاوانەکەی بەسەردا دەسەپێنێ.

٣/پەیماننامەی شەرەفی یەکیەتی گشتی ڕۆژنامەنووسانی عەرەب

یەکیەتی گشتی ڕۆژنامەنووسانی عەرەب هەر لەگەڵ دامەزراندنیدا بایەخی بە مەسەلەی ئیتیکی پیشەیی داوە،لە کۆنگرەی دامەزراندنیدا کە ساڵی ١٩٦٤ گرێدرا، بەرپرسیارییەتە ئەخلاقی و پیشەییەکانی ڕۆژنامەنووسانی عەرەبی بەرامبەر بە کۆمەڵگاکانیان دەسنیشانکرد، و ئەو بەرپرسیارییەتیانەشی وەك مولزەم بەسەر ئەو ڕۆژنامەنووسانە سەپاند کە سەر بە سەندیکا عەرەبیە ئەندامەکانن لە یەکیەتی گشتی ڕۆژنامەنووسانی عەرەب.

**لە پەیماننامەی شەرەفی یەکیەتی ناوبراودا هاتووە:**

١/پێویستە ڕۆژنامەنووسی عەرەبی بەراستگۆیی و ئەمانەتەوە زانیاری و هەواڵەکان بخاتەروو.

٢/پێویستە ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی بکات لەو زانیارییانەی دەیخاتە بەردەم ڕای گشتی.

٣/دەبێ بەبایەخەوە هەوڵبدات ڕاستییەکان وەك خۆی بخاتەڕوو و ڕێگە نەدات بەدەستی ئەنقەست ڕاستییەکان بشێوێندرێ.

٤/پێویستە بزانێ بەدەستهێنانی سوودی تایبەت لەڕێگەی پیشەکەیەوە هەرگیز یەکانگیر نیە لەگەڵ ئەخلاقی ڕۆژنامەگەری،هەروەها ناوزڕاندن و درۆ و دزینی بابەتی خەڵکی و وروژاندنی نارەوای خەڵك لەڕێگەی وێنە و کاریکاتێر و بڵاوکردنەوەی ڕووداوەکانی تاوان بە شێوەیەك کە هانی خەڵکی دیکە بدات بۆ ئەنجامدانی،هەموویان دژ بە بەها ئاکارییەکانی پیشەی ڕۆژنامەنووسین.

٥/مافی ڕۆژنامەنووسی عەرەبە پارێزگاری لە نهێنی سەرچاوەکانی هەواڵ بکات و گوشاری نەکرێتە سەر بۆ درکاندنیان.

٦/پێویستە ڕۆژنامەنووس ئەو ڕاستکردنەوە یان ڕوونکردنەوانە بلاّوکاتەوە کە بەهۆی هەواڵ یان زانیارییە بلاّوکراوەکانەوە خەڵکی دیکە ئاڕاستەی دەزگاکەی دەکات.

٧/خەباتکردن دژی هەموو شێوەکانی سەرکوتکردن و تەسککردنەوەی پانتایی ئازادییەکان،یان هەر کردارێکی دیکەی ناشەرعی کە تاك یان دەوڵەت دژی ڕۆژنامەنووسان ئەجامی دەدات.

٨/پێویستە ڕێز لە هاوپیشەکانی بگرێت و هەوڵی جێگەگرتنەوە یان دەرکردنیان نەدات،نابێ ڕۆژنامەنووسان مافە پیشەییەکانیان لە پێناو وەدەستهێنانی بەرژەوەندی تایبەت بەکار بێنن،هەروەك چۆن نابێ بەرپرسی دەزگاکان ڕۆژنامەنووسان بۆ کاری دیکە لەدەرەوەی بازنەی پیشەکەیان ڕابسپێرن.

٩/پابەندبوون بەو بنەما ئەخلاّقیانە شتێکی ئیلزامیە و دەبێ ڕۆژنامەنووسانی عەرەب بەرگری لێبکەن و کاریش بۆ جێبەجێکردنیان بکەن.

سێیەم:پەیماننامەی شەرەفی چەند دەزگایەکی ڕاگەیاندن

لە ئێستادا بەهۆی فراوانبوونی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و کاریگەری هەستیار و ڕاستەوخۆیان لەسەر کۆمەڵگە،پەیماننامە ئاکارییەکان سنوری سەندیکا و کۆمەڵە ڕۆژنامەوانییەکان یان ڕۆژنامەنووسانی ولاّتێکی دیاریکراویان بەزاندووە، بەشێوەیەك خەریکە هەر دەزگایەك دەبێتە خاوەن پەیماننامە یان گرێبەستی ئەخلاّقی تایبەت بەخۆی،پەیماننامە ئەخلاّقییەکانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەگشتی دوو شێوەی سەرەکین،یەکەمیان پەیماننامەی نووسراو و ڕاگەیاندراون،دووەمیشیان پەیماننامەی شەفەهین شێوەی گرێبەستێکی ئەخلاّقی نێوان کارمەندانی دەزگاکان.بەلاّم هێشتا ژمارەیەکی زۆری دەزگاکان بێ پەیماننامەی ئاکارین، و ئەو پەیماننامە نێوخۆییانە تەنها دەزگا ڕۆژنامەوانیە موعتەبەر و دێرینەکانی گرتۆتەوە.لێرەدا بەپێویستی دەزانین نموونەی چەند پەیماننامەیکی ئەو دەزگایانە بخەینەڕوو:

## ١/پەیماننامەی ئەخلاّقی کارمەندانی ئاژانسی هەواڵی ئیسیۆشێتدپرێس

ئاژانسی هەواڵی ئیسیۆشێتدپرێس چەند بنەمایەکی ئاکاری ڕاگەیاندووە پێویستە سەرجەم کارمەندانی ڕەچاوی بکەن و پابەندی بن،ئەوانیش بریتین لە:

١/بەرپرسیارییەتی:ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە لە پەیماننامەی ئاژانسی نێوبراودا ڕاستگۆ و ئازاد و بەرپرس و سەربەخۆ و دادپەروەرە،ڕاستی ڕێگە نیشاندەریەتی، و هەواڵ و زانیارییەکان بێلایەنانە بلاَودەکاتەوە.

٢/وردبینی:پێویستە ڕۆژنامەنووس وردبین و ئەمین بێ لە گواسنەوەی هەواڵ و زانیارییەکان، و هەمووی وەك خۆی دوور لە بڕن و دەسکاری بلاَوبکاتەوە.

٣/ئەمانەت:پێویستە پانتاییەکی فراوان بۆ ڕاگۆڕینەوەو ڕاو ڕای جیاواز و ڕەخنەگرتن فەراهەم بکرێ،ئەگەر هاتوو ڕەخنە و بۆچوونەکانیش ناکۆك بن لەگەڵ بۆچوونەکانی دەزگاکە،دەبێ ڕۆژنامەنووس هەوڵی بلاَوکردنەوەی هەموو هەواڵێك بدات ئەگەر زەرەری بۆ دەزگاکەشی هەبوو.

٤/نابێ ڕۆژنامەنووس هیچ شتێك بەرامبەر بلاَوکردنەوەی هەواڵ یان ڕاپۆرتێك لە هیچ کەس و لایەنێك قەبووڵ بکات،هەروەك نابێ دیاری وەربگرێ و بەشداری لە چالاکی سیاسی بکات،ناشبێ لەیەك کاتدا لە دوو دەزگای ڕۆژنامەوانی کاربکات.

**٢/پەیماننامەی شەرەفی کارمەندانی ئاژانسی هەواڵی یونایتید پریس ئینتەرناسیونال**

پەیماننامەی شەرەفی ئاژانسی هەواڵی یونایتید پرێس ئینتەرناسیونال لەسەر دوو بنەمای سەرەکی دامەزراوە ئەوانیش:

١/تێکەڵنەکردنی خێرایی و سەبق لە بلاَوکردنەوەی هەواڵدا.

٢/پێویستە ڕۆژنامەنووسانی ئاژانسەکەمان بەر لە ڕۆژنامەنووسانی دیکە هەوڵی وەدەستهێنانی هەواڵ بدەن،بەلاَم بێ ئەوەی خێرایی لە دەستکەوتنی هەواڵدا ببێتە هۆی هەڵەکردن.

سەبارەت بە سیاسەتی ڕۆژنامەوانی ئاژانسی یونایتیدپرێس ئینتەرناسیونالیش ئاژانسەکە جەخت لەسەر ئەو خالاَنە دەکات:

١/تایبەتمەندی:مافی هەموو کەسێکە پارێزگاری لە تایبەتمەندی و ژیانی تایبەتی بکات.

٢/دیاری :نابێ بەهیچ شێوەیەك کارمەندانی ئاژانسەکەمان دیاری لەو کەس و دەزگایانە قەبول بکەن کە هەواڵ و چالاکییەکانیان بلاَودەکەنەوە.

٣/قەبوڵنەکردنی بلیتی سەفەرکردن لە هیچ دەزگا و کەسایەتییەك تەنها لە ڕۆژنامە یان ئەو ئاژانسەی ڕۆژنامەوان کاری تێدا دەکات.

٤/نەبەخشینی هەواڵ و زانیاری بەشێوەی خۆبەخشانە بەهیچ رۆژنامەنووس و دەزگایەکی راگەیاندن،هەروەك چۆن نابێ رۆژنامەنووس زانیاری و هەواڵ بە دەزگا سیخوڕیەکان بدات.

٣/پەیماننامەی شەرەفی کارمەندانی ئاژانسی هەواڵی فرانس پرێس

ئاژانسی فرانس پرێس یەکێکە لە ئاژانسە هەواڵییە بەناوبانگەکانی دونیا،ساڵی ١٩٤٤ لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا دامەزراوە، نووسینگە و پەیامنێری لە (٢٠٠ )وڵات هەیە،(٢٢٦٠) کارمەند کاری تێدادەکەن،فرانس پرێس خزمەتگوزارییە ئیعلامیەکانی لەرێگەی دەنگ و وێنەوە نووسینەوە بە جەماوەر دەگەیەنێت،یەکێکە لە ئاژانسە هەواڵییە **پێشەنگەکان لە راگەیاندنی پەیماننامەی شەرەفی پیشەیی تایبەت بەخۆی کە بنەماکانی بریتین لە:**

١/گەیاندنی راستییەکان ئامانجی سەرەکی ئاژانسەکەمانە،بیرو بۆچوون و مەزندەی کەسی شوێنی نیە لە هەواڵ و راپۆرتەکانماندا.

٢/پێویستە هەواڵ هەموو توخمە سەرەکیەکانی هەواڵ لەخۆبگرێت،ونبوونی هەر توخمێك مانای ناتەواوی هەواڵ دەگەیەنێت.

٣/وردبینی و بلاۆنەکردنەوەی هەواڵی نادروست،لە حاڵەتی روودانی هەر هەڵەیەك پێویستە بەخێرایی و بێ دوو دڵی راستبکرێتەوە،چونکە ئەم کارە مسداقیەتی دەزگاکانی راگەیاندن لای جەماوەر بەهێزتر دەکات.

٤/بابەتیەت وجۆراوجۆری لە دارشتن و بلاۆکردنەوەی هەواڵدا،فرانس پرێس ئاژانسێکی هەواڵی سەربەخۆیە،لەژێر کاریگەری دەوڵەتی فەرەنسا و کۆمپانیا و نێوەندە بازرگانییەکان بەدەرە،بۆیە دەبی کارمەندانی بەوپەڕی بێلایەنی و مەوزوعیەتەوە رووداوەکان رومالبکەن،ململانێ و رووداوەکان سەر بە چ رەگەز و نەتەوە و ئاین و چین و توێژێکبن،پێویستە رۆژنامەنووس بەیەك چاو سەیریان بکا و پیشەگەرانە رووماڵیان بکات.

## ٤/پەیماننامەی شەرەفی کارمەندانی کەناڵی ئاسمانی(ئەلجەزیرە)

کەناڵی ئاسمانی(ئەلجەزیرە)ساڵی **١٩٩٦** دامەزراوە،یەکێکە لە کەناڵە ئاسمانییە عەرەبی و جیهانییەکان،سەرەڕای تەمەنی کورتی، پسپۆڕان (ئەلجەزیرە)بە بازدانێکی نەوعی لە میدیای عەرەبی و رۆژهەلاّت لەقەڵەم دەدەن، هەنوکە کەناڵی(ئەلجەزیرە)پەیامنێری لە(١٥٠)وڵات هەیە،وێڕای کۆمەڵەی کەناڵە وەرزشییەکانی،بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی

بەرنامەکانی پەخشدەکات. (ئەلجەزیرە) کۆمەڵێك بنەمای پیشەیی هەیە کە شێوەی پەیماننامەی شەرەفی نێوان کەناڵەکە و کارمەندانی وەرگرتووە،ئەوانیش بریتین لە:

١/پابەندبوون بە بەها گشتییەکانی رۆژنامەوانی لە راستگۆیی و وردبینی و هاوسەنگی و سەربەخۆیی و مسداقیەت.

٢/هەوڵدان بۆ گەیشتن بە راستییەکان لە میانی پەخشکردنی هەواڵ و راپۆرت و بەرنامەکانمان.

٣/پێشبڕکێکردن لە وەدەستهێنانی هەواڵ و بلاّوکردنەوەی،بەلاّم لەسەر بنەمای نەزیهـ و ئەخلاّقیانە.

٤/رێزگرتن لە بینەر و تایبەتمەندی و خواستەکانی،لەگەڵ رەچاوکردنی هەست و شعوری کەسوکار و قوربانیانی جەنگ و کارەسات و تاوانەکان.

٥/رەخساندنی بوار بۆ را و رای جیاواز،تەرەفگیرینەکردن بۆ هیچ کەس و لایەنێك.

٦/مامەڵەکردنی بابەتیانە لەگەڵ تایبەتمەندی نەتەوە و رەگەز و تایەفە جیاوازەکان.

٧/داننان بە هەڵە و ناڕاستییەکان و دوانەکەوتن لە پۆزشهێنانەوەو راستکردنەوەیان.

٨/جیکاریکردن لە نێوان هەواڵ و تەعلیقلێدان و رادەربڕین دەربارەی هەواڵ و پێشهاتەکان.

٩/پەیڕەوکردنی شەفافیەت دەربارەی سەرچاوەکانی هەواڵ و پابەندبوون بە پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی ئەو بوارە.

١٠/پاڵپشتیکردن لە هاوکاران و کارمەندان لە کاتی دەستدرێژیکردنە سەریان،هاریکاریکردنی سەندیکا رۆژنامەوانییە عەرەبی و نێودەوڵەتییەکان بۆ داکۆکیکردن لە ئازادی میدیا و رۆژنامەگەری.

## ٥/پەیماننامەی شەرەفی رۆژنامەی (واشنتۆن پۆست)

رۆژنامەی واشنتۆن پۆست لە پەیماننامەئاکارییەکەیدا زۆر جەخت لەسەر تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە دەکات و پێی وایە لەبەر ئەوەی بەها کلتووریەکانی کۆمەڵگە لە گۆڕاندان پێویستە رۆژنامەکەش زوو زوو بە بنەما ئاکارییەکانی دابچێتەوە،پێویستە رێز لە خوێنەر بگیرێ،نابێ وشەی نەشیا و و نەگونجاو کە ئادابی گشتی کۆمەڵگە قەبوڵی ناکات بەکاربهێندرێت.

سەبارەت بە دیاری و بلێتی سەفەرکردنیش،واشنتۆن پۆست بەهیچ شێوەیەك رێگە بە کارمەندانی نادات دیاری و داوەتنامە و داوەتکردن قەبوڵ بکەن،لە روانگەی واشنتۆن پۆستەوە

هیچ شتێك بە خۆڕایی بێ بەرامبەر نیە،بەڵکە بەرامبەر خزمەتێکە کە لە رابردوودا یان داهاتوو پێشکەش بە لایەنی دیاریبەخش کراوە یان دەکرێت،بۆیە لەم گۆشەنیگایەوە(واشنتۆن پۆست) سەرجەم شێوەکانی دیاری،داوەتکردن،وەرگرتنی بلێتی فرۆکە ،ئاهەنگی وەرزشی و مۆسیقی و کۆمەڵایەتی بەخۆڕایی لە کارمەندانی حەرام کردووە، و هەر کارمەندێك سەرپێچیی بکات،بە توندترین شێوە سزا دەدرێت.

# دەرووی سێیەم

## یاساکانی راگەیاندن

### بەشی یەکەم: جۆر و گرنگی یاساکانی راگەیاندن.

### بەشی دووەم: یاسای رۆژنامەگەری کوردستان و چەند سەرنجێك.

# بەشی یەکەم

## جۆر و گرنگی یاساکانی راگەیاندن

لەگەڵ ئەوەی هەریەك لە یاسا و پەیماننامە ئاکارییەکان بۆ رێکخستنی ژیانی رۆژانەی مرۆڤ و پەیوەندی مرۆڤەکانە لەگەڵ یەکتری و دیاریکردنی تایبەتمەندی پیشە جیاجیاکانە،وەلێ جیاوازی بنەڕەتی لە رووی بەرپرسیاریەتییەوە لە نێوانیاندا هەیە،جیاوازی هەرە بەرچاو لە نێوان یاساو پەیماننامە ئەخلاقیەکان بریتییە لەوەی کە بەرپرسیارییەتی یاسایی بەرپرسیارییەتێکی دیاریکراوە، گرێدراوی پەیوەندی مرۆڤە بە کۆمەڵە تەشریعاتێکەوە دیارکراوەوە ،بەلاّم بەرپرسیارییەتی ئەخلاقی بەرپرسیارییەتێکی فراوانە،فراوانترە لە بازنەی یاسا،چونکە گرێدراوی پەیوەندی مرۆڤە بە خودی خۆی و پەروەدگارەوە،بەرپرسیارییەتی ئەخلاقی بەرپرسیارییەتیەکی زاتی مرۆڤە بەرامبەر بە خودا و ویژدانەوە،کەچی بەرپرسیارییەتی یاسایی بریتیە لە سلوکی مرۆڤ بەرامبەر کەسانی دیکە،سێهەمین خاڵی جیاواز لەنێوان یاسا و پەیماننامە ئاکارییەکان بریتییە لەوەی کە بەرپرسیارییەتی ئاکاری جێگیر و نەگۆڕاوە بەلاّم بەرپرسیارییەتی یاسایی ناجێگیرە لەگەڵ گۆڕانکاری و هەموارکردنی یاساکان گۆڕانی بەسەردادێت،هەروەها لایەنی جێبەجێکاری بنەما ئاکارییەکان ویژدانی مرۆڤە،کەچی جێبەجێکردنی یساکان پێویستی بە هێزی جێبەجێکارە کە خۆی لە پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش دەبینێتەوە.کەواتە هەرگیز ویژدان وئادابی مرۆڤ نابنە جێگرەوەی یاساکان،بەڵکە بەرپرسیارییەتی یاسایی و کۆمەلاّیەتی وەك دوو رووی یەك دراو وان و تەواوکەری یەگدین ،ناکرێ رۆڵ و گرنگی هیچکامێکیان پشتگوی بخرێ لە رێکخستنی پیشە جیاجیاکانی مرۆڤ.

تەشریعاتە یاساییەکانی ولاّتان تایبەت بە رێکخستنی کاری رۆژنامەگەری جیاواز و جۆراوجۆرن،ئەم جیاوازییە لە جیاوازی فەلسەفە ئیعلامییە پەیڕەوکراوەکان لەلایەن ولاّتانەوە لەلایەك، و جیاوازی قۆناخە سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتیەکانی میللەتان لەلایەکی دیکەوە،سەرچاوە دەگرێ،بۆنموونە بەپێی تەشریعاتی بەلجیکی رۆژنامەنووس کەسێکە خزمەتی

مرۆڤایەتی و بەرژەوەندی گشتی دەکات،کەچی یاسای فەرەنسی جەخت لەسەر وەدەستهێنانی زانیاری دەکات لەرێگەی شەرعییەوە، دوور لە بەرتیل و رەشوە بەخشین،تەشریعاتە ئیعلامیەکانی یۆنانیش تەرکیز لەسەر بلاۆنەکردنەوەی هەواڵ و زانیاری هەڵە و خۆبەدوورگرتنی رۆژنامەوان لە تانە و تەشهیر و ناو زڕدان دەکەنەوە.لە نەرویژیش یاساکان داوا لە راگەیانکاران دەکەن لەکاتی هەڵەکردن و بلاۆکردنەوەی زانیاری هەڵەدا زوو هەڵەکانیان راستبکەنەوەو پۆزش بهێننەوە،یاساکانی سویدیش جەخت لەسەر بلاۆنەکردنەوەی وردەکاری رووداوەکانی تاوان و ناوی تۆمەتباران و تاوانکاران دەکاتەوە، لە تورکیاش یاساکان سزای تووند بەسەر ئەو رۆژنامەوانانە دەسەپێنن کە پیشەکەیان بۆ مەرام و بەرژەوەندی شەخسی بەکاردێنن،تەشریعاتە ئیعلامیەکانی روسیاش داوا لە میدیاکاران دەکات موبالەغە و وشەی گاڵتئامێز لە داڕشتنی ئەو بابەتە رۆژنامەوانیانە بەکارنەهێنن کە دەربارەی لەشفرۆشی و سێکس و تاوانن.

سەربارەی ئەو یاسا ئیعلامییە نێوخۆییانەی ولاّتان کە ئاماژەمان پێدا،لەئاستی نێونەتەوەیشدا یاسایەك هەیە تایبەت بە رێکخستنی کاری میدیا ئەویش یاسای نێودەوڵەتی رۆژنامەگەرییە،بەر لە باسکردنی ئەو یاسایە ،سەرەتا پێناسەیەکی گشتی یاسا دەخەینەڕوو، لەگەڵ دەسنیشانکردنی جۆرەکانی و ئامانجی لە کۆمەڵگەدا.

## یاسا چییە؟

کۆمەڵێك تەشریعات و پێوەرەی گشتگیرە بۆ رێکخستنی پەیوەندییە کۆمەلاّیەتیەکانی کۆمەڵگە و تاکەکان،پێویستە هەموو لایەك پابەندبن پێیان و سەرپێچیان نەکەن،سەرپێچیکردنیان تاك رووبەڕووی سزا و لێپێچینەوە دەکات لەلایەن دەسەلاّتی گشتییەوە.

هیچ کۆمەڵگەیەك بیّ یاسا نیە و هیچ یاسایەکیش بیّ کۆمەڵگە نیە،یاساکان لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێن،یەکێکیان یاسا نێوخۆییەکانن کە تایبەتن بە کۆمەڵگە و ولاّتێکی دیاریکراو،دوومەیشیان یاسای نێودەوڵەتییەکانن کە کۆمەڵە دەوڵەت و رێکخراو و دەستەیەکی نێودەوڵەتی بەشدارن لە داڕشتنیدا.

یاسای گشتی: کۆمەڵە بنەما و پێوەرێکی یاسایی گشتییە،سەرجەم کۆمەڵگە و تاکەکانی دەگرێتەوە،رێکخستنی سەرجەم بوارە کۆمەلاّیەتییەکانی تاك لەخۆدەگرێت.وەك(یاسای بنەڕەتی عێراقی و ،یاسای بنەڕتی فەرەنسی و یاسای بنەڕەتی میسری و ...تاد).

یاسای تایبەت: کۆمەڵە بنەما و پێوەرێکی یاساییە، موشەریع یان دەسەلاتی یاسادانەری وڵاتێك دایدەڕێژێت،بۆ ڕێکخستنی بوار و چالاکیەکی دیاریکراوی کۆمەڵگە وەك(یاسای هەڵبژاردن،و یاسای ڕۆژنامەگەری، و یاسای هاتوچۆ، و یاسای چاپەمەنی،و یاسای شارەوانییەکان و...تاد).

## ئەرکی یاسا چییە؟

بریتییە لە ڕێکخستنی کۆمەڵگە لەپێناو زامنکردنی ئاسایش و ئاشتی کۆمەلایەتی و دادپەروەری و دەسەبەرکردنی یەکسانی لە نێوان تاکەکاندا،بۆ ئەم مەبەستەش یاسا ئەرك و مافی تاکەکان دیاریدەکات.

## یاسای ڕۆژنامەگەری

یاسای ڕۆژنامەگەری یان ڕاگەیاندن کۆمەڵێك بنەما و پێوەری یاساییە بۆ ڕێکخستنی ئازادی ڕادەربڕین و کار و چالاکی ڕاگەیاندن و ئامرازەکانی،بەشێکە لە یاسا تایبەتەکان،کە چالاکی تاکەکان لە بوارێکی کۆمەلایەتی دیاریکراودا ڕێکدەخات.

### یەکەم:گرنگی یاسای ڕۆژنامەگەری بۆ کۆمەڵگە

ئازادی میدیا و نووسین و بلاوکردنەوە بەشێکن لە ئازادی ڕادەربڕین بەمانا فراوانەکەی،بەپێی ئەم چەمکە هەموو کەسێك مافی ڕادەربڕینی هەیە بەشێوەیەکی ئازادانە،وەك یاسا دانرا و ئاسمانییەکانیش جەختی لەسەر دەکەن،بەلام بۆ ئەوەی ئەو ئازادییە لەلایەن خەڵکانێك نەقۆسترێتەوە و نەبێتە هۆکاری دەستدرێژی کردنە سەر ژیانی تایبەتی و ئازادی کەسانی دیکە،یان مەترسیخستنە سەر ئاشتەوایی کۆمەلایەتی و بەرژەوەندییە گشتییەکان،پێویستە لە چوارچێوەی یاسا و تەشریعاتی تایبەتدا ڕێکبخرێت،لێرەوە گرنگی یاسای ڕاگەیاندن بەرجەستە دەبێت کە کرۆکەکەی بریتییە لە هاوسەنگیکردن لەنێوان بەرپرسیارییەتی و ئازادییەکاندا.

بەواتایەکی دیکە یاساکانی ڕاگەیاندن لەگەڵ ئەوەی جەخت لەسەر مافی هەموو تاکێك دەکەن لە دەربڕینی ئازاددا،هاوکات بەپێویست و زەروریشی دەزانن ئازادی ڕادەربڕین ڕێزبگرێت لە ماف و ئازادی کەسانی دیکە و ئەخلاق و بەرژەوەندی گشتی.

**دووەم:جۆرەکانی یاسای ڕاگەیاندن**

یاسای ڕاگەیاندن لە چوار جۆری سەرەکی پێکدێت ئەوانیش:

١/یاسای پیشەیی ڕاگەیاندن:

ئەم یاسایە لایەنی پیشەیی ڕاگەیاندن ڕێکدەخات،وەك چۆنیەتی دامەزراندنی سەندیکا و ڕێکخراوە ڕۆژنامەوانییەکان،و شێوازی ئەندام وەرگرتن، و مەرجەکانی، و دەسەڵاتەکانی سەندیکا، و توانای سزادانی ئەندامانی لەکاتی سەرپێچیدا،لەگەڵ دەسنیشانکردنی ماف و ئەرکەکانی میدیاکار و پابەندییەکانی.

مەبەستیش لە وشەی(پیشە)هەر کار و جووڵە و چالاکییەکە کە مرۆڤ بۆ وەدەستهێنانی داهاتێکی دیاریکراو ئەنجامی دەدات.

کەواتە ڕۆژنامەنووسی پیشەگەر بەو کەسە دەگوترێت کە کاری سەرەکی ڕۆژنامەوانی بێت و لەڕێگەی کارکردنی بەردەوام بۆ دەزگایەك یان چەند دەزگایەك داهات و بژێوی ژیانی دابین بکات. بۆیە کاری ڕۆژنامەنووس لە هەر دەزگایەك لەرووی پیشەگەرییەوە پێویستە ئەم خاڵانە لەخۆبگرێت:

- بەرامبەر بەو کارەی ئەنجامی دەدات،ڕۆژنامەنووس گرێبەستێکی کاتی یان هەمیشەیی لەگەڵ ئەو دەزگایەی کاری بۆ دەکات،گرێدەدات.
- ئەگەر خاوەنکار کاری زیادەی بە ڕۆژنامەنووس کرد پێویستە بەرامبەر بەو ماندووبوونە پارەی زیاتر لە گرێبەستەکەی بۆ هەژمار بکات.
- لەحاڵەتی بڵاوکردنەوەی بابەتی ڕۆژنامەنووس،دەبێ مافی پارێزرا و بێ و خاوەنکار مووچەکەی هەر پێبدات.

**٢/یاسای ئامرازەکانی ڕاگەیاندن:**

ئەم یاسایە شێواز و چۆنیەتی کارکردنی هۆ یان ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە بوارە جیاجیاکانی ڕۆژنامەگەری وەك چاپەمەنی و ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن و سایتی ئەلکترۆنی و...تاد ڕێکدەخات،بۆ نموونە یاسای **tv** جۆرەکانی تەلەڤزیۆن و چۆنیەتی دامەزراندن و خاوەندارێتی و پەخش و بابەتە پەیوەندارەکانی دیکە بە کاری تەلەڤزیۆنی ریکدەخات.

**٣/یاسای تاوان و سزای ڕاگەیاندن:**

ئەم یاسایە تایبەتە بە سەرپێچی و تاوانی ڕۆژنامەنووس و دەزگاکانی ڕاگەیاندن،تیایدا جۆرەکانی تاوانی ڕاگەیاندن و سزاکان دەسنیشانکراوە،بەتایبەت ئەو تاوانانەی دەبنە مایەی

پێشێلکردنی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگە و ماف و ئازادییەکانی تاك.هەندێك لە تاوانەکانی ڕاگەیاندن بەهۆی ئەم یاسایەوە سزای دیاریکراوی بۆ داندراوە،هەندێکی دیکەشیان لەرێگەی یاسی تاوان و سزای گشتییەوە سزاکانیان دەسنیشانکراوە.

## ٤/یاسای نێودەوڵەتی راگەیاندن

هەوێن یان بیرۆکەی یاسای نێودەوڵەتی راگەیاندن و یاسا نێوخۆییەکانی دیکە ولآتان لە میساقی نەتەوەیەکگرتووەکان،و جارنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨ز سەرچاوە دەگرێ،لە (٦٠) ساڵی رابدووداچەندین یاسای نێودەوڵەتی بۆ رێکخستنی کاری میدیا و پارێزگاریکردن لە رۆژنانەوانان و پاراستنی مافەکانیان لەسەردەمی جەنگ و ئاشتیدا دارێژراون،هەندێك لەو یاسایانە لە شێوەی پەیماننامەی عورفی نامولزەمن،هەندێکی دیکەشیان مولزەمن و هێزی جێبەجێکردن وەردەگرن،وەك جارنامە نێودەوڵەتیەکەی مافی مرۆڤ.

لێرەدا بەشێوەیەکی کورت ئاماژە بۆ ناوەرۆکی دیارترین ئەو پەیماننامەو یاسا نێو نەتەوەییانە دەکەین،کە هەندێکیان بۆ حاڵەتی ئاسایی و ئاشتی دارێژراون،هەندێکی دیکەشیان بۆ سەردەمی جەنگ،سەرەتا بە یاساکانی سەردەمی ئاشتی دەستپێدەکەین ئەوانیش بریتین لە:

### أ/جارنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ

ئەم جارنامەیە ساڵی ١٩٤٨ راگەیەندرا،سەرجەم ولآتان مولزەم دەکات بە جێبەجێکردنی،وەك یاسایەکی نێودەوڵەتی عورفی وایە، لە دوو ماددەدا باس لە پرسی ئازادی رادەربڕین دەکات، ئەوانیش ماددەی (١٩)و ماددەی(٢١)،ئەو دوو مادەیە ولآتان ئیلزام دەکات بە رێزگرتن لە ئازادی رادەربڕین.

لە ماددەی(١٩)ئەم جارنامەیەدا هاتووە"هەموو کەسێك مافی رادەربڕینی هەیە،ئەم مافەش مافی هەڵگرتنی بیروبۆچوون و گەڕان بە دوای هەواڵ و بلآوکردنەوی بە هەر کەرەستەو شێوازێك بێ،دەگەیەنێت)).

### ب/پەیمانی نێونەتەوەیی مافە مەدەنی و سیاسییەکان

ئەم پەیمانە ساڵی ١٩٦٦ لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ئیقرار کرا،ماددەی(١٩)جەخت لەسەر ئازادی رادەربڕین و وەدەستهێنانی زانیاری دەکات لەهەر شوێن و بە هەر کەرەستەیەك بێ،هەروەك جەخت لەسەر مافی بلآوکردنەوەی هەواڵ و زانیارییەکان دەکات بە کەرەستە جیا جیاکانی گەیاندن،بێ رەچاوکردنی سنووری جوگرافی و سیاسی.

ج/پەیماننامەی یونیسکۆ دەربارەی دەزگاکانی راگەیاندن

ئەم پەیماننامەیە ساڵی ١٩٧٨ز راگەیەندرا،تیایدا مافی رادەربڕین و ئازادی راگەیاندن بە بەشێك لە مافەکانی مرۆڤ هەژماردەکات،هەروەها راگەیاندنی ئازاد و هۆکانی بە فاکتەرێکی گرنگی چەسپاندنی مافی مرۆڤ و بەرەنگاربوونەوەی رەگەزپەرستی و پاڵپشتیکردن لە تەبایی و ئاشتی نێودەوڵەتی دادەنێت.

**د/راپۆرتەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی ئازادی رادەربڕین**

ئەم راپۆرتە ساڵی ١٩٩٣ لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە راگەیەندرا،تیایدا بەگرنگەوە باس لە زەرورەتی بەگشتیکردنی زانیارییەکان و گەیشتنی رۆژمامەنووسان بەسەرچاوەکانی هەواڵ کرابوو.

**ه/راگەیەندراوی جۆهانسبۆرگ**

ئەم راگەیەندراوە ساڵی ٢٠٠٢ تەبەنی کرا،لە دوو بەش پێکدێت،ئاسایشی نەتەوەیی و ئازادی وەدەستهێنانی زانیاری،ئەم راگەیەندراوە ئازادی وەدەستهێنانی زانیاری و گەیشتن بەسەرچاوەکانی هەواڵ بە بەشێکی گرنگی مافی رادەربڕن لەقەڵەم دەدات.

و/دادگای ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ

ساڵی ٢٠١٠ دادگای ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ بۆ یەکەمین جار مەسەلەی ئازادی رۆژنامەگەری تەبەنیکرد،بەبۆچونی دادگای ناوبراو بۆ ئەوەی میدیا بتوانێ بەرۆڵی راستەقیتەی خۆی هەڵبستێ،پێویستی بە پارێزگاریکردنی تایبەت و ئاسانکاری هەیە.

**ی/دەستووری زۆرینەی وڵاتان**

لە دەستووری زۆربەی وڵاتاندا چەند ماددەیەك بەئاشکرا باس لە ئازادی رادەربڕین و راگەیاندن دەکەن،بەڵام زۆرینەی ئەو ماددە دەستووریانە بە چەند دەستەواژەیەکی مەتاتی وەك(لەچوارچێوەی یاسا،و بەو مەرجانەی کە یاسا دیاریان دەکات، و بەشێوەیەك کە گونجاوبێ لەگەڵ یاساکان) سنووردار و کۆت و بەند کراون.

سەبارەت بە یاسا نێودەوڵەتییەکانی جەنگیش دەربارەی میدیا،تیشك دەخەینە سەر دوو لەو یاسایانە،ئەوانیش:

**أ/یاسای نێودەوڵەتی مرۆڤایەتی**

لە پرۆتۆکۆلی ژنێڤی ساڵی ١٩٤٩ دەربارەی پارێزگاریکردن لە خەڵکی سڤیل لەکاتی جەنگ و ئاشوبدا هاتووە"رۆژنامەنووس مامەڵەی خەڵکی مەدەنی لەگەڵ دەکرێت لە

گۆرەپانەکانی جەنگدا،پێویستە هەموو لایەك پارێزگاری لێبکەن،بەمەرجێك نەبێتە بەشێك لە لایەنەکانی شەڕەکە".

### ب/ راپۆرتی لیژنەی خاچی سووری نێودەوڵەتی

خاچی سووری نێودەوڵەتی ساڵی ٢٠٠٥ لە راپۆرتێکیدا جەخت لەسەر زەرورەتی پارێزگاریکردن لە رۆژنامەنووسان دەکات لەکاتی رووماڵکردنی رووداوەکانی جەنگدا و داوا دەکات لایەنە شەڕکەرەکان حیسابی خەڵکی سڤیلیان بۆ بکەن.

ج/بڕیاری ١٧٣٨ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی

ماددەی (٣٤) لەم بڕیارە جەخت لەسەر ئەم خالآنە دەکات:

- سەیرکردنی تیمە رۆژنامەوانییەکان لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا وەك خەڵکی سڤیل و بێدیفاع
- هەژمارکردنی کەلوپەل و ئامێر و دەستگە رۆژنامەوانییەکان وەك موڵك و سامانی خەڵکی سڤیل.
- ئیدانەکردنی ئەو دەستدرێژیانەی دەکرێتە سەر رۆژنامەنووسان و دەزگا ئیعلامیەکان

ئایا لە روانگەی یاسای نێودەوڵەتی راگەیاندنەوە دەوڵەت مافی داڕشتنی یاسای تایبەت بەخۆی هەیە؟؟

بەپێی بەندی (١٩) جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨ز، و بەندی (١٩) پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە سیاسی و مەدەنییەکانی ساڵی١٩٦٦ز، هەموو ولآتێك مافی داڕشتنی یاسای رۆژنامەگەری و رێکخستنی ئازادی رادەربڕینی هەیە.

### سێیەم:فاکتەر و بنەماکانی داڕشتنی یاسای رۆژنامەگەری

بە وردبوونەوە لە ناوەڕۆکی پەیماننامە و جاڕنامە نێودەوڵەتی و ئیقلیمییەکان دەربارەی مافە بنچینەییەکانی مرۆڤ و یاسای رۆژنامەگەری وچاپەمەنی،دەکرێ گرنگترین ئەو هۆکار و بنەما یاساییانەی کە موشەریعی یاسایی پشتی پێدەبەستێت لە داڕشتنی یاسادا لە مانەی خوارەوە کۆ بکەینەوە:

**یەکەم:**پاراستنی ئاسایشی نیشتمانی:زۆر جار بەبیانووی بەزاندن یان مەترسی خستنە سەر ئاسایشی نیشتمانی،بەتایبەت لە حاڵەتی جەنگی دەرەکی یان ناوخۆیی،دەسەڵآت سانسۆر دەخاتە سەر رۆژنامەگەری تا رادەی داخستنی دەزگا رۆژناماوانییەکان و قەدەخەکردنی

بلاْوكردنەوەی رۆژنامەیەكی دیاریكراو،لە كاتی شەڕ و هێرشی دەرەكیدا گەر رۆژنامەنووس یەكێك لەم كارانەی خوارەوە ئەنجام بدات،رووبەڕووی سزا دەبێتەوە:

١/بلاْوكردنەوەی ئەو هەواڵ و زانیارییانەی ئاسایشی ولاْت دەخەنە مەترسییەوە.

٢/دركاندنی نهێنییە سەربازییەكان.

٣/دركاندنی نهێنییە فەرمییەكانی دەوڵەت.

٤/دركاندنی گفتوگۆی داخراوی پەرلەمان و دامو دەزگا فەرمییەكانی دیكەی دەوڵەت.

٥/هاندانی سەربازان بۆ سەرپێچیكردن.

٦/هاندانی خەڵكی بۆ سەرپێچیكردن و ئاژاوەگێڕی و ،سوكایەتیكردن بە یاسا و دەوڵەت.

٧/سوكایەتیكردن بە خەڵك و بەهاكانیان.

٨/چاندنی تۆوی دووبەرەكی و ناكۆكی ئایینی و تایەفی و ئیتنی.

دووهەم:پاراستنی بەها و ئەخلاْقی گشتی:گەر رۆژنامەنووس بابەت دژی ئەخلاْقی گشتی و بەهاكان بلاْوبكاتەوە،ئەوا رووبەڕووی سزای یاسایی دەبێتەوە،بە تایبەت لەكاتی بلاْوكردنەوەی :

١/ ئەو بابەتانەی پێشێلی بەها و ئەخلاْقە گشتییەكان دەكەن.

٢/ پەیوەندی سێكسی نێوان(محارم)یان هەواڵی خۆكوشتنی تاكەكانی كۆمەڵگە.

٣/ ئەو بابەتانەی هانی منداڵ و هەرزەكاران دەدات بۆ كاری خراپ و نەشیاو.

سێهەم:داكۆكیكردن لە ئابڕوو و كەڕامەتی هاولاْتیان:هەر رۆژنامە و رۆژنامەوانێك ببێتە هۆی لەكەداركردنی ئابڕوو و ناوزڕاندنی هاولاْتیان،سزا دەدرێت،بەتایبەت لە حاڵەتی:

١/جنێودان و ناوزڕاندن و شێواندنی كەسایەتی و ناوبانگی هاولاْتیان.

٢/بلاْوكردنەوەی هەواڵ و زانیاری درۆ لەسەر هاولاْتیان.

٣/سووكایەتیكردن بە مردووان.

٤/بلاْوكردنەوەی ژیانی تایبەتی تاك و بنەماڵە و خێڵەكان.

چوارەم:پاراستنی رەوتی دادوەری:سەرجەم ئەو كردار و زانیارییانەی كاریگەری خراپ بكەنە سەر رەوتی دادوەری و لێكۆڵینەوە،وەك:

١/بلاْوكردنەوەی دانیشتنە نهێنییەكانی دادگا.

٢/بلاْوكردنەوەی هەواڵ زانیاری دەربارەی ئە و رووداو و تاوانانەی لە قۆناخی لێكۆڵینەوەدان و دادگا بڕیاری كۆتایی لەبارەیانەوە نەداوە.

پێنجەم:پاراستنی سیستەم و دامەزراوەکانی دەوڵەت:هەرجۆرە کردار و هەوڵێك ببێتە مایەی تێکدانی سیستەم و دامودەزگا گشتییەکان،یاسا بەتووندی رووبەڕووی دەبێتەوە.

## چوارەم: جۆرەکانی بەرپرسیارییەتی یاسای راگەیاندن

یاسای رۆژنامەگەری یان راگەیاندن چوار بەرپرسیارییەتی سەرەکی لەخۆدەگرێت،ئەوانیش بریتین لە:

١/بەرپرسیارییەتی ویژدانی(ئەخلاقی):واتا رۆژنامەنووس کار و چالاکییەك ئەنجام دەدات کە بەرامبەر ئاکار و ویژدانی خۆی بەرپرسیارە.

٢/بەرپرسیارییەتی سزا:لە حاڵەتی ئەنجامدانی هەر تاوانێك پێویستە رۆژنامەنووس ئامادەی وەرگرتنی سزا بێت و قەبوڵی بکات.

٣/بەرپرسیارییەتی ئیداری:رۆژنامەنووس بەرامبەر ئەو دەزگایەی کاری بۆ دەکات بەرپرسیارە.

٤/بەرپرسیارییەتی مەدەنی:پێویستە رۆژنامەنووس ئامادەی قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە بێ کە بەهەڵە لەکاتی کارکردنیدا بەر کەسێکی دەگەیەنێت.

## پێنجەم: ئەرك و مافەکانی رۆژنامەنووس لە یاسای نێودەوڵەتی راگەیاندندا

یاسای نێودەوڵەتی راگەیاندن بۆ رێکخستنی کاری میدیایی کۆمەڵە ماف و بەرپرسیارییەتێکی بۆ رۆژنامەنووس دەسنیشانکردووە، زۆر گرنگە میدیاکاران زانیاریان لەبارەیەوە هەبێ و لەکاتی کارکردندا رەچاوی بکەن.

### أ:مافەکان

بەپێی ئەم یاسایە رۆژنامەنووس کۆمەڵ مافێکی دیاریکراوی هەیە ئەوانیش:

١/رۆژنامەنووس مافی وەدەستهێنان و بلاوکردنەوە و شرۆڤەکردنی زانیاری و هەواڵی هەیە.

٢/رۆژنامەنووس مافی بەکارهێنانی ئامرازەکانی کاری راگەیاندنی هەیە لە دەنگ و رەنگ و تۆمارکردن و پێداویستییەکانی نووسین.

٣/رۆژنامەنووس مافی چاوپێکەوتنی لەگەڵ بەرپرسان و فەرمانبەر و خەڵکی سادە و خاوەن کار و سەرمایەداران هەیە،هەروەك چۆن مافی سەردانیکردنی دامودەزگا حکومی و ناحکومییەکانیشی هەیە بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری.

٤/ڕۆژنامەنووس مافی وردبوونەوە و بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی هەواڵ و زانیاریەکانی هەیە.

٥/لەکاتی دزین و گۆڕینی بابەتەکانی،ڕۆژنامەنووس مافی وەرگرتنەوەی ناو و ئیعتیباری خۆی هەیە.

٦/ڕۆژنامەنووس مافی ئامادەبوونی لە ڕێپێوان و کۆڕ و کۆبوونەوەکان و مانگرتن و خۆنیشاندان و شوێنی ڕووداوە گشتی و کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان هەیە.

٧/مافی نووسینەوە و تۆمارکردنی ئەو زانیاریانەی هەیە کە تایبەتن بە بەرژەوەندی گشتی، بەو مەرجەی ناکۆك نەبن لەگەڵ بنەماکانی مافی مرۆڤ و هاولاتی.

٨/مافی ڕۆژنامەنووسە ببێتە ئەندام لە سەندیکا و ڕێکخراو و نێوەندە ڕۆژنامەوانییە نێوخۆیی و ئیقلیمی و نێودەوڵەتییەکان.

٩/ڕۆژنامەنووس لەپێناو داکۆکیکردن لە بەرژەوەندی گشتی،بەو پێیەی ئەو چاوی کۆمەڵگەیە، مافی بلاوکردنەوەی ئەو هەواڵ و زانیارییانەی هەیە کە تایبەتن بە کەسانێك کە هەڵسوکەوت و کردارییان دژی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەیە،هەروەها مافی بلاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی گەندەڵی سیاسی و دارایی گەندەڵکاران و بەکارهێنانی خراپی دەسەلاَت لەلایەن دەسەلاَتدارانەوەهەیە.

١٠/مافی ڕۆژنامەنووسە بابەت و نووسینەکانی بەناوی ڕاستەقینەی خۆی،یان ناوی خوازراو بلاوبکاتەوە.

١١/ڕۆژنامەنووس مافی وەدەستهێنان و بەکارهێنانی هەموو ئەو مافانەی هەیە، کە یاسا گشتی و تایبەتییەکانی ولاَت بۆیان دیارکردووە.

## ب: ئەرك و بەرپرسیارییەتیەکانی ڕۆژنامەنووس

ڕۆژنامەنووس وەك چۆن مافی هەیە،کۆمەڵێك ئەرك و بەرپرسیارییەتیشی دەکەوێتە ئەستۆ،ئەوانیش:

١/ڕێزگرتن لە دەستور و یاسا بنەڕەتییەکانی ولاَت و یاسا نێودەوڵەتییەکان.

٢/دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی هەواڵ و زانیارییەکان،ئامادەکردن و بلاوکردنەوەی بابەتییانەی هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان.

٣/وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەو کەسانەی کە ڕۆژنامەنووس بەنیازە هەواڵ و وێنە دەربارەی ژیانی تایبەتییان بلاوبکاتەوە.

٤/تێکەڵنەکردنی شرۆڤە و بیروبۆچوونی شەخسی لەگەڵ هەواڵ و راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان.

٥/رەچاوکردنی پرەنسیپ و ستراتیژیەتی ئەو دەزگایەی رۆژنامەنووس کاری تێدا دەکات،لەپێناو پتەوکردنی رۆحی هاوکاری و پەیوەندی پیشەیی.

٦/رێزگرتن لەو بەها یاساییەی کە دەڵێت:تۆمەتبار بێتاوانە تا ئەوکاتەی دادگا تاوانەکەی بەسەردا ساغدەکاتەوە.

٧/پێویستە رۆژنامەنووس هاولاتیان و بەرپرسان لەکاتی چاوپێکەوتن یان رومالکردنی پرێس کۆنفراسدا ئاگاداربکاتەوە کە لەوانەیە وێنە یان قسەکانیان بلاوبکاتەوە.

٨/خۆبەدوورگرتن لە بلاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و گۆتەگۆت لەکاتی ئامادەکردنی هەواڵ و هەر بابەتێکی دیکەی رۆژنامەوانی.

٩/پێویستە رۆژنامەنووس رێز لە کەسایەتی و پێگە و ئابڕووی کەس و لایەن و رێکخراو و دامەزراوە حکومی و ناحکومیەکان(ئەوانەی دەکەونە نێو بازنەی کارو چالاکی رۆژنامەوانییەوە)بگرێت.

١٠/پێویستە رۆژنامەنووس پێشوەختە سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین، بەر لە بلاوکردنەوەی ئەو بابەتانەی گومانی لێپرسینەوەیان لێدەکرێت لەلایەن دادگاوە،ئاگادار بکاتەوە.

١١/بەرپرسیارییەتی شێواز و ناوەڕۆکی هەواڵ و نووسین و راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان لە ئەستۆی رۆژنامەنووس دایە،بەلاَم بەرپرسیارییەتی لێدوان و راگەیەندراو و بەیاننامە حکومی و ناحکومییەکانی ناکەوێتە ئەستۆ.

١٢/نابێ بەهیچ شێوەیەك بەرتیل و دیاری و پاداشت بەرامبەر بە رومالکردنی رووداو و چالاکی و هەوالەکان لە هیچ کەس و لایەنێك وەربگرێت.

١٣/پێویستە رۆژنامەنووس تەواو پابەندی بنەما پیشەییەکانی ئیتیکی رۆژنامەوانی بێت.

## پشتگیری و بەرپرسیارییەتی یاسایی حکومەت بەرامبەر رۆژنامەنووس و دەزگاکانی راگەیاندن

زۆرینەی یاساکانی راگەیاندنی ولاتان بە شێوازی زۆراوجۆر داکۆکی و پشتگیری لە رۆژنامەنووس و دەزگا رۆژنامەوانییەکان دەکەن،کە بەگشتی لەم خالانەی خوارەوە کۆکراوەتەوە:

١/ئەركی دەوڵەتە پارێزگاری لە ناو و ناوبانگ و كەسایەتی و ئابڕوو و مافە پیشەییەكانی ڕۆژنامەنووسان بكات.

٢/پێویستە ڕۆژنامەنووس لە ئەنجامدانی ئەركە پیشەییەكانی ئازاد و پارێزراو بێ.

٣/ئەركی دامەزراوەكانی ڕاگەیاندنە تەندروستی و سەلامەتی و خۆشگوزەرانی ڕۆژنامەنووسان دابین بكات،دەبێ دەوڵەتیش لەلای خۆیەوە پشتگیری و داكۆكی لەو كارە بكات.

٤/بەلەبەرچاوگرتنی زیان و مەترسی و سەختی پیشەی ڕۆژنامەنووسی،دەبێ یاسای كار و مەترسی،كاری ڕۆژنامەنووسیش بگرێتەوە.

٥/دەستوەردانی دەوڵەت لە كاروباری ڕۆژنامەوانی بە هەموو شێوەكانیەوە قەدەغەیە.

٦/دوور لە بڕیاری دادگا،هەموو شێوە پشكنین و دەستبەسەرداگرتنێكی بەڵگەنامە و دۆكۆمێنت و تۆمارێكی دەنگی و ڕەنگی و ئەلیكترۆنی و كۆمپیوتەری قەدەغەیە.

٧/لەكاتی وەستان یان داخران یان داخستنی هەر دەزگایەكی ڕۆژنامەوانی،دەبێ بیمەی بێكاری بۆ ڕۆژنامەنووسەكان ببڕدرێتەوە تا ئەو كاتەی دەزگاكە دووبارە دەست بەكاركردن دەكاتەوە،یان ڕۆژنامەنووسەكە كارێك دەدۆزێتەوە.

هەروەها هەر بەپێی یاسا، بەرپرس و خەڵكی حكومی و ناحكومی و خەڵكی ئاسایی پێویستە خۆیان لەم كارانە بەدووربگرن بەرامبەر بە میدیاكاران:

١/كۆنترۆڵ و سانسۆرخستنە سەر ڕۆژنامەگەری.

٢/هەڕەشەكردن و تەماحەدان بە ڕۆژنامەنووسان.

٣/دركاندنی ناوی خوازراوی ڕۆژنامەنووس و سەرچاوە نهێنی و تایبەتییەكانی زانیاری.

٤/بەربەست دروستكردن و دژایەتیكردنی ڕۆژنامەنووس.

٥/دەستدرێژیكردنە سەر مافە یاساییەكانی ڕۆژنامەنووس و سووكایەتیكردن بە ئابڕوو و كەسایەتی ڕۆژنامەنووس.

٦/پێنەدانی زانیاری بە ڕۆژنامەنووس و ریگەگرتن و بەربەست دروستكردن لە گەیشتنی بە زانیاری و سەرچاوەكانی هەواڵ.

٧/هەڕەشەكردن لە ژیانی تایبەتی و كۆمەڵایەتی ڕۆژنامەنووس و پەلاماردانی و زیانگەیاندن بە تەندروستی.

## بەشی دووەم

# یاسای رۆژنامەگەری کوردستان و چەند سەرنجێك

یاسای ژمارە(٣٥)ی ساڵی ٢٠٠٧ تایبەت بەرێکخستنی کاری رۆژنامەگەری لە کوردستان،کە بە(یاسای رۆژنامەگەری کوردستان) ناودەبرێت،ئەو یاسایە سەرئەنجامی راو بۆچوون و پێشنیاری چوار کۆنگرەی ئەندامانی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە کە بەندە لە سیانیان ئەندام بووە،یەکەمین کۆنگرە کە کۆنگرەی دامەزراندن بوو کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٨ بەسترا،لە کۆنگرەکانی دواتر پێشنیاری چەندیین گۆڕانکاری و کەمکردنەوە و زیادکردن و لابردن و هەمواركردنی بڕگە و ماددەی یاسایی کرا،لەگەڵ بەرزکردنەوەی چەندین راسپاردە و پێشنێنار.لەم یاسایەدا ماف و ئەرك و بەرپرسیارییەتییەکانی رۆژنامەنووس بە یاسا رێکخراوە،لەگەڵ پێناسەی کەسایەتی رۆژنامەنووس، و مەرجەکانی دەرکردنی هەر رۆژنامە و بلاۆکراوەیەك.لەم بەشەدا هەڵدەدەین لەبە تێروتەسەلی رۆشنایی بخەینە سەر یەکە یەکەیان وەك ئەوەی لە یاساکە هاتووە.

### یەکەم:رۆژنامەنووس و رۆژنامە لەیاسای رۆژنامەگەری کوردستاندا

أ:رۆژنامەنووس

ناساندنی کەسایەتی رۆژنامەنووس لە یاسای رۆژنامەگەری کوردستاندا،جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ تەعریفە نێودەوڵەتییەکەی رۆژنامەنووس کە دەڵێت:

"رۆژنامەنووس ئەو کەسەیە کە مومارەسەی پیشەی رۆژنامەگەری دەکات لە بواری بینراو یان بیستراودا، و رۆژنامەگەری وەك پیشەی سەرەکی خۆی هەڵبژاردووە".

لە بڕگەی پێنجەمی ماددەی یەکەم لە یاسای رۆژنامەگەری کوردستانیش پێناسەیەکی سادەی رۆژنامەنووس دەبینین کە دەڵێت:

"هەر کەسێك کە لە بواری رۆژنامەگەریدا لەهەر کەناڵێکی راگەیاندندا کاردەکات".

هەر بەپێی یاسای ناوبراو هەر کەسێك یەك لەم ناونیشانانەی خوارەوەی هەبێت پێی دەگووترێت رۆژنامەنووس:

١/خاوەن ئەمتیاز

٢/سەرنووسەر

٣/جێگری سەرنووسەر

٤/بەڕێوەبەری نووسین

٥/سکرتێری نووسین

٦/نووسەر

٧/وەرگێڕی رۆژنامەگەری

٨/پەیامنێر

٩/وێنەگر

١٠/شێوەکار و کاریکاتێرستی رۆژنامەوانی

١١/دیزاینەر

١٢/هەڵەچنی رۆژنامە

١٣/رێکخەری ئەرشیفی رۆژنامەگەری

١٤/ژنەفتکاری رۆژنامەوانی

گەر لەو ناونیشانانە وردبینەوە دەبینین بەهیچ شێوەیەك ئاماژە بۆ ناونیشانی کارمەندانی رادیۆ و تەلەڤزیۆنەکان نەکراوە، وەك بێژەر،بەڕێوەبەری **tv** ....تاد

## مەرجەکانی بوون بەئەندام لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان

سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان چوار مەرجی سەرەکی دیاریکردووە بۆ قەبوڵکردنی داواکاری ئەوانەی دەیانەوێت ببنە ئەندام لە سەندیکاکە،ئەوانیش:

١/دەبێ هاووڵاتی هەرێمی کوردستان بێت،یان لە هەرێمی کوردستان نیشتەجێبێت.

٢/دەبێ ئەهلیەتی پیشەیی و یاسایی هەبێت.

٣/بە جینایەتێ یان جونحەیەکی ئابڕووبەر حوکم نەدرابێ.

٤/دەبێت یەکێك لە ناونیشانە رۆژنامەوانییەکانی هەبێت،وەك سەرنووسەر،پەیامنێر، نووسەر وێنەگر...تاد

یاسای رۆژنامەوانی وڵاتانیش بەگشتی چەند مەرجێکی دیاریکردووە بۆ ئەندام بوون لە سەندیکا رۆژنامەوانییەکان،یان دەسنیشانکردنی کەسی رۆژنامەنووس، کە مەرجەکانی ئەندامبوون لەسەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانیش هەر لەوەوە هەڵێنجراون،ئەوانیش بریتین لە:

١/**هاوڵاتی ئەو وڵاتە بێت.**

٢/لە روانگەی یاساوە پێشینەی ئەخلاقی خراپی نەبێت.

٣/تەمەنی لە ١٨ ساڵ کەمتر نەبێت.

٤/پابەندی بنەما ئەخلاقییەکانی پیشەی رۆژنامەنووسی بێت.

٥/خاوەن توانا و تایبەتمەندی بێت لە بواری رۆژنامەوانیدا.

## شێوازی ئەندامبوون لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان:

بۆ ئەندامبوون لە سەندیکا دەبێ رۆژنامەوان ئەو رێگە و شوێنانە بگرێتەبەر:

یەکەم:داوایەك بەنووسین پێشکەش دەکرێت بە ئەنجوومەنی سەندیکا،ئەو بەرهەم و بابەتانەی لەگەڵ بێت کە داواکار بلاوی کردۆتەوە،یان هەر شتێکی دیکە گەواهی ئەوە بدات کە داواکار ئیشی رۆژنامەنووسی کردووە،ئەنجوومەنیش پێویستە لەماوەی سێ رۆژدا داواکارییەکە تاوتوێبکات،ئەگەر کاتەکە تێپەڕی و داواکە بە بنبڕی سەیرنەکرابوو،ئەوە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە قەبولکراو لەقەڵەم دەدرێت.

دووەم:ئەگەر داواکە قەبووڵ نەکرا،لایەنی پەیوەندار پێویستە هۆکاری قەبووڵ نەکردنەکەی پیشان بدات،داواکارەکەش بۆی هەیە لەماوەی پانزە رۆژدا،کە لەرۆژی تەبلیغییەوە دەستپێدەکات،لە دادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانی عێراق تانە لە قەبووڵنەکردنەکەی بدات،ئیدی بڕیاری تەمییز بنبڕ و یەکلاکەرەوەیە.

جۆرەکانی رۆژنامەنووس لە سجلی گشتی سەندیکای رۆژنامەنووسانی هەرێمی کوردستان

لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستاندا پلەبەندی بۆ جۆرەکانی رۆژنامەنووس کراوە،بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم:رۆژنامەوانی بەرمەشق:ئەو کەسەیە کە پیشەی سەرەکی خۆی کردووە بە رۆژنامەوانی و تا دوو ساڵی لەسەر یەکیش بەسەر پیادەکردنی ئەم پیشەیەیدا تێنپەڕێ و ناونیشانی لە سجلی گشتیدا تۆمار نەکرێت،نازناوی رۆژنامەوانی کارای پێ نابەخشرێ و هیچ

ئیمتیازاتێکی وەك ئیمتیازەکانی رۆژنامەوانی کارای پێنادرێ تا ئەو کاتەی ناوی خۆی دەگوازێتەوە ناو لیستی ئەو پۆلە،جا ئەو کاتە ماوەی مەشقەکەی دەخرێتە سەر ماوەی خزمەتەکەی، ماوەی پلەکاریش بۆ کەسێ بڕوانامەی لە رۆژنامەگەری و راگەیاندن،یان هاوتاکانی ئەو بڕوانامەیەدا هەبێت،یەك ساڵە.

دووەم:رۆژنامەوانی کارا:ئەو کەسەیە کە بە رەفتار لە هەرسێ کەناڵەکانی رۆژنامەگەریدا،دوو ساڵ کاریکردووە،یان دوو ساڵە کاری تێدا دەکات و کردوونی بە پیشەی سەرەکی خۆی و،ئەو ماوەیەش کە لە بڕگەی یەکەمدا دیارکراوە،بەسەر ئیشەکەیدا تێپەڕیووە.

سێهەم:رۆژنامەوانی هاوپشك:ئەو کەسەیە کە ئیش و کاری رۆژنامەوانی دەکات،بەلاّم نەیکردووە بە پیشەی سەرەکی خۆی و ،بەڵگەی ئەوەشی ئەو گرێبەستانەیە کە لایەنە پەیوەندارەکان بۆی دەسەلمێنن،مافی ئەوەشی هەیە پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك کە لە پێنج ساڵ لەسەر یەك کەمتر نەبێت،ناوی خۆی بگوازێتەوە بۆ سجلی گشتی رۆژنامەوانان و،پیشەی رۆژنامەگەرییەکەشی بکات بە پیشەی هەمیشەیی خۆی.

**ب:رۆژنامە**

بەپێی پێناسەی نێودەوڵەتی راگەیاندن،رۆژنامە بریتییە لە:

"هەر بلاّوکراوەیەك کە هەفتانە یان رۆژانە بە شێوەیەکی خولی رێك و پێك،لە ژێر ناو و ژمارەبەندی دیاریکرا و دەربچێت،رۆژنامەیە".

سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانیش بەمجۆرە پێناسەی دەکات:

"هەر چاپکراوێك کە بەشێوەیەکی خولی و بە ناوێکی دیاریکراو بەژمارەی ریزبەند و بە رێکوپێکی دەربچێ و دابەش بکرێ".

چۆنیەتی دەرکردنی رۆژنامە

سەبارەت بە دەرکردنی رۆژنامەش ،ماددەی سێهەم لە یاسای رۆژنامەگەری کوردستان لە شەش بڕگە یاسادا، مەرج و رێکارە یاساییەکانی دەرکردنی هەر رۆژنامەیەکی دیاریکردووە،ئەوانیش بریتین لە:

یەکەم:خاوەن ئیمتیاز یان دامەزرێنەرەکەی راگەیاندنێك لە دوو رۆژنامەی رۆژانەی هەرێم بلاّوەدەکاتەوە،کە ناو و نازناو و رەگەزنامە و شوێنی نیشتەجێبوونی خاوەن ئیمیتیاز یاخود، دامەزرێنەر و ناوی رۆژنامەکە و ئەو زمانەی کە پێی بلاّودەکرێتەوە،لەگەڵ ناوی سەرنووسەر و ماوەی دەرچوونی تێدا بنووسرێ.راگەیاندنەکەش بەبەیانی دەرکردنی رۆژنامەکە دادەندرێ.

دووەم:دەشێ خاوەن هەر بەرژەوەندییەك لەدەركردنی رۆژنامەكە ناڕازی بێ و بۆی هەیە لە ماوەی (٣٠)رۆژ لە مێژووی بلاَوكردنەوەی راگەیاندنەكەوە لەلای دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەكە لە هەرێم بە سیفەتی پێداچوونەوە ناڕەزایی تۆماربكات و بە پێچەوانەوەش دەركردنی رۆژنامەكە بەپەسەندكراو دادەندرێ.

سێهەم:پێویستە خاوەن ئیمتیاز یان دامەزرێنەرەكەی ،بەیاننامەی دامەزراندن لە سەندیكای رۆژنامەنووسان تۆمار بكا،لەگەڵ بەدەرخستنی سەرچاوەی ئەو لایەنەی داراییەكەی لێ دابین دەكا و سەندیكاش وەزارەتی رۆشنبیری لێ ئاگادار بكاتەوە.

چوارەم:ئەو كەسەی كە نیازی دەركردنی رۆژنامەی هەیە ،دەبێ لەرووی یاساییەوە شایستەیی(ئەهلیەت)ی تەواوی هەبێ.

پێنجەم:نابێ لە هەرێمدا دوو رۆژنامە بەیەك ناو دەربچن.

شەشەم:پێویستە خاوەن ئیمتیاز یان دامەزرێنەرەكە لەشوێنێكی دیاری رۆژنامەكە بەشێوەیەكی روون ناوی خۆی و سەرنووسەر و شوێن و مێژووی دەرچوونی رۆژنامەكە و ناوی ئەو چاپخانەیەی كە لێی چاپ دەكرێ بلاَوبكاتەوەو راگەیاندنێك لەهەر گۆڕانكارییەك ،یان هەمواركردنێك لەسەر ناوەڕۆكی بەیانی دامەزراندن رووبدات،لەماوەی(٣٠)رۆژ لە رێكەوتی گۆڕانكارییەكە،یان هەمواركردنەكەدا بلاَوبكاتەوە.

هەر پەیوەست بە پرسی دەركردنی رۆژنامە، ماددەی چوارەمی یاسای رۆژنامەگەری كوردستان باس لەوە دەكات كە هەر رۆژنامەیەك سەرنووسەرێكی دەبێ،بەلاَم بەپێی ئەو مەرجانەی خوارەوە:

یەكەم:دەبێ رۆژنامەنووس بێ و زمانی رۆژنامەكە بە خوێندنەوەو نووسین بزانێ.

دووەم:سەرنووسەر و نووسەر بەرپرسیارییەتی مەدەنی و سزایی ئەو بابەتانەیان لەئەستۆدایە كە بلاَودەكرێنەوە،هەرچی خاوەن ئیمتیازە بەرپرسیارییەتی دەدەنی دەكەوێتە ئەستۆ،بەلاَم ئەگەر بەشداری لە نووسینی رۆژنامەدا كردئەوا هەمان بەرپرسیارییەتی سەرنووسەر هەڵدەگرێ.

لە حاڵەتی وازهێنانی خاوەن ئیمتیازیش لە بەشێك یان لە هەموو خاوەندارێتی رۆژنامەكە بۆ كەسێكی دیكە،بەپێی ماددەی پێنجەمی یاسای رۆنامەگەری كوردستان،دەبێ خاوەن ئیمتیاز (٣٠)رۆژ پێش مێژووی دیاریكراوی وازهێنانەكەی ئاگادارییەك لە رۆژنامەیەكی رۆژانە بلاَوبكاتەوە.

## شـێوازی وەلاَمدانــەوەو راســتكردنەوەی هەڵــەی رۆژنامەنووســی لــە یاســای رۆژنامەگەری كوردستان

یاسای نێوبراو لە سێ بڕگە یاسادا ئەم حاڵەتەی ڕێکخستووە،ئەوانیش:

**یەکەم**:ئەگەر ڕۆژنامە زانیاری نادروستی بلاوکردەوە،ئەوا ئەو کەسەی بابەتە بلاوکراوەکەی پێ پەیوەستە،یاخود یەکێك لە میراتگرانی،یان ئەوەی لەرووی یاساییەوە جێگریەتی،بۆی هەیە داوای راستکردنەوەی بکاو وەلامی هەواڵ یان وتارەکە بداتەوە،پێویستە سەرنووسەریش راستکردنەوە،یاخود وەلامدانەوەکە لە یەکێك لە دوو ژمارەی دوای مێژووی گەیشتنی وەلامەکە لەهەمان جێ و بەهەمان پیت و هەمان ئەو قەبارەیەی کە پێی بلاوکراوەتەوە،بلاوبکاتەوە.

**دووەم**:پێویستە رۆژنامە وەلامدانەوە یان راستکردنەوە بلاوبکاتەوە،بەپێچەوانەوە بە بڕێك پارە کەلە(١٠٠٠٠٠٠)یەك ملیۆن دینار کەمتر و لە(٢٠٠٠٠٠٠)ملیۆن دیناریش پتر نەبێ،غەرامە دەکرێ.

**سێیەم**:سەرنووسەر بۆی هەیە وەلامدانەوەکە یان ئەو راستکردنەوەیەی بە پێی بڕگەی یەکەم و دووەمی سەرەوە بۆی دێت،لەم حاڵەتانەی خوارەوە بلاونەکاتەوە:

١/ئەگەر رۆژنامەکە بەر لەگەیشتنی وەلام یان راستکردنەوەکە،بابەتە بلاوکراوەکەی بەشێوەیەکی وردو تەواو راستکردبووەوە.

٢/ئەگەر وەلامدانەوەکە،یان راستکردنەوەکە،بەناوێکی خوازراوەوە بێ،یان بە زمانێکی جیا لە زمانی بابەتە بلاوکراوەکە نووسرابوو.

٣/ئەگەر ناوەڕۆکی وەلامدانەوە و راستکردنەوەکە پێچەوانەی یاسا بێ.

٤/ئەگەر وەلامدانەوە،یان راستکردنەوە دوای (٩٠)نەوەد رۆژ لە بلاوکردنەوەی هەواڵ،یان وتارە وەلامدراوەکە گەیشت.

## ئامانجەکانی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان

سەندیکا هەوڵی وەدەستهێنانی ئەم ئامانجانە دەدات:

١/رێزگرتن و داکۆکی لە ئازادی رۆژنامەوانی و ئازادی رادەربڕین،هەروەها داکۆکی لە مافی رۆژنامەوانان و زامنکردنی پاراستنیان لە بەجێهێنانی ئەرك و فەرمانیاندا.

٢/ئەرکی دەسکەوتنی دەنگ و باس و زانیارییەکان بۆ رۆژنامەوانان ئاسان بکات.

٣/کردنە ئەندامی سەندیکاکە لە یەکیەتیگەلی رۆژنامەگەری جیهانی و ناوچەیی،هەروەها دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵیاندا.

٤/قاڵکردنی رۆژنامەوان بەهەموو شێوازێ بلوێ و بکرێ.

٥/پشتیوانی و لایەنگرتن لە رۆژنامەوانان لە حاڵەتی زەرووردا.

٦/بەرجەستەکردنی رژێمی فیدراڵی،یان هەر شتێکی دیکە کە گەلی کوردستان خۆی بەدڵی بێ.

٧/داکۆکیکردن لە بنەماکانی دیموکراسی و،ئازادییە بنەڕەتییەکان و،ئاشتی و،بنەماکانی مافی مرۆڤ.

٨/پشتیوانی لە خەباتی گەلی کوردستان لەپێناو وەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی خۆی و،رەواج پێدانی بنەمای لێبووردەیی و بێ زەبرو زەنگی لە کۆمەڵگا و،داکوتانی رەگی رابوونی نەتەوەیی و،ئایینی و یەکسانی لە هەرێمی کوردستاندا.

٩/بەشداریکردن لە بنیاتنانی بەدامەزراوەیی کردنی دەوڵەت و ،بەهێزکردنی بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان.

١٠/پاراستنی سەروەری یاسا و سەربەخۆیی دادوەری.

١١/پاراستن و بەرەو باشترگۆڕینی رۆشنبیری نەتەوەیی و نیشتمانی.

## دووەم:ماف و ئەرکەکانی رۆژنامەنووس لە یاسای رۆژنامەگەری کوردستاندا

ماددەی حەوتەم لە یاساکە بەمجۆرە ماف و ئیمتیازاتی رۆژنامەنووسانی کوردستانی دەسنیشان کردووە:

١/رۆژنامەنووس سەربەخۆیە، و لە بەجێهێنانی ئەرکە پیشەییەکەی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەرەوە نیە جگە لە دەسەڵاتی یاسا.

٢/نابێ ئەو راو بۆچوونانەی کە لەلای رۆژنامەنووس دەردەچێ،یان ئەو زانیاریانەی کە بلاویان دەکاتەوە ببنە هۆی تێکدانی باری ژیانی،یان زیان بەخۆی و مافەکانی بگەیەنێ.

٣/رۆژنامەنووس مافی ئەوەی هەیە سەرچاوەی زانیارییەکانی ئاشکرا نەکا،تەنها بەبڕیاری دادوەر نەبێ.

٤/رۆژنامەنووس مافی ئامەدەبوونی لە کۆنگرە و چالاکییە گشتییەکاندا هەیە.

٥/هەرکەسێك بەهۆی کارەکەیەوە سووکایەتی بە رۆژنامەنووس بکات،یان دەستدرێژی بکاتە سەر،ئەوا هەمان ئەو سزایە دەیگرێتەوە کە بۆ دەستدرێژیکردنە سەر فەرمانبەرێك لەکاتی یان بەهۆی بەجێهێنانی ئەرکەکانی دانراوە.

٦/ئەگەر گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە سیاسەتی ئەو رۆژنامەیە روویدا کە رۆژنامەنووسەکە کاری تێدا دەکات،یان بارودۆخی گرێبەستەکەی گۆڕا،رۆژنامەنووس بۆی هەیە ئەو گرێبەستە یەکلایەنە

هەڵبوەشێنێتەوە،بەمەرجێك(٣٠) سی ڕۆژ پێش ئەو هەڵوەشاندنەوەیە ئاگاداری ڕۆژنامەكە بكاتەوە،بێئەوەی مافی ڕۆژنامەنووسەكە لە قەرەبوو كردنەوەدا بفەوتێ.

٧/پێویستە دەزگاكانی ڕۆژنامەگەری و بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەكان پابەندی هەموو ئەو مافانە بن كە لە یاسا بەركارەكان و گرێبەستی پەسندكرا و لەلایەن سەندیكای ڕۆژنامەنووسان بۆ ڕۆژنامەنووسان دیاریكراون.

٨/لەبارێكدا ئەگەر ڕۆژنامەنووس هەموو مۆڵەتە ئاساییەكانی،یان هەندێكیانی دوای كۆتایی ساڵی دارایی وەرنەگرتبوو،ئەوا ئەو پارەیەی پێدەدرێ كە دەیكەوێ بەمەرجێك لە مووچەی مانگێكی كەمتر نەبێ.

٩/لەكاتی تووشبوونی ڕۆژنامەنووس بەنەخۆشی و پێكان لەكاتی ڕاپەڕاندنی ئەركەكەی،یان لە پێناویدا ئەو دەزگا ڕاگەیاندنەی كە كاری تێدا دەكا،خەرجی چارەسەركردنی دەكەوێتە ئەستۆ.

١٠/ئەگەر ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژانی پشووی فەرمیدا كاری كرد،پێویستە ئەو دەزگا ڕۆژنامەگەرییەی كاری تێدا دەكا قەرەبووی ماددی ئەو ڕۆژانەی بۆ بكاتەوە بەبڕی كرێی دوو ڕۆژ بۆ هەر ڕۆژێك.

هەر لە یاسای ڕۆژنامەگەری كوردستان،لە مادەی هەشتەمدا لەژێر ناونیشانی پشتەوانە،یاساكە حەسانەی كاری بۆ ڕۆژنامەنووسان چەسپاندووە، ،پشتەوانەی ڕۆژنامەوانانی كوردستان پێنج خاڵی سەرەكی لەخۆدەگرێت،بریتین لە:

١/لەكاتی گرتنەبەری ڕێكاری یاسایی بەرامبەر ڕۆژنامەنووس كە بەكارێك تۆمەتبار دەكرێ پەیوەندی بە پیشەكەیەوە هەیە،سەندیكای لێئاگادار دەكرێتەوە.

٢/نابێ لێكۆڵینەوە لەگەڵ ڕۆژنامەنووس بكرێ،یان شوێنی كار و ماڵەكەی بپشكنرێ لەبەر ئەو هۆیەی لە بڕگەی (یەكەم )ی ئەم ماددەیەدا هاتووە مەگەر بەبڕیاری دادوەر نەبێ و نەقیب یان ئەوەی بەشێوەیەكی یاسایی جێیدەگرێتەوە بۆی هەیە لەكاتی لێكۆڵینەوەدا ئامادەبێ.

٣/لەهەر لێكۆڵینەوەیەكی سزاییدا،نابێ دیكۆمێنت و زانیاری و بەیاننامە و پەڕاوگەكانی ڕۆژنامەنووس بە بەڵگەی تۆماركردن دژی بەكاربهێندرێ،تەنیا مەگەر پەیوەندییان بەبابەتی سكاڵای تۆماركراو لە دژی ڕۆژنامەنووسەوە هەبێ.

٤/نووسین و بلاَوكردنەوە لەسەر كارەكانی فەرمانبەر یان كەسێكی ڕاسپێردراو بۆ خزمەتگوزاری گشتی،یان سیفەتی نوێنەرایەتی گشتی هەبێ تاوان نییە ئەگەر هاتوو بلاَوكردنەوەكە لە چوارچێوەی

ئەرکی فەرمانبەری و خزمەتی گشتی و نوێنەرایەتی دەرنەچێ بەو مەرجەی بەڵگەی سەلمێنەری دانە پاڵیان لەسەر هەبێ.

٥/نابێ دوای تێپەڕبوونی(٩٠)نەوەد ڕۆژ لە مێژووی بلاۆکردنەوە، هیچ جۆرە ڕێکارێکی یاسایی لەبەرامبەر ڕۆژنامەنووس بگیرێتەبەر.

لە یاسای ڕۆژنامەگەری کوردستان لەگەڵ ئەوەی هیچ ماددەیەکی یاسایی بەئاشکرا بە ناونیشانی ئەرك یان بەرپرسیارییەتی نیە بۆ دیاریکردنی ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان،وەلێ یاساکە لە ماددەی نۆیەمیدا کۆمەڵێك بەرپرسیارییەتی و کاری قەدەغەکراو دەسنیشان دەکات کاتێك لەبڕگەی یەکەم دەڵێت:

ڕۆژنامەنووس و سەرنووسەر بە بڕێك پارە غەرامە دەکرێن کە لە(١٠٠٠٠٠٠)یەك ملیۆن دینار کەمتر و لە(٥٠٠٠٠٠٠)پێنج ملیۆن دینار پتر نەبێ،کاتێك یەکێك لەم خالاٌنەی خوارەوە بلاۆبکاتەوە:

١/چاندنی تۆی رق و کینە و لێکترازاندنی پێکهاتەکانی کۆمەڵ.

٢/سوکایەتیکردن بە بیروباوەڕ و ڕێوڕەسمە ئایینییەکان.

٣/سوکایەتیکردن بە سیمبول و پیرۆزییەکانی هەر ئایین و ئایینزایەك و لەکەدارکردنیان.

٤/هەربابەتێك پەیوەندی بە نهێنییەکانی ژیانی تایبەتی تاکەوە هەبێ،هەرچەندە ڕاستیش بێ،بەلاٌم بلاۆکردنەوەی ببێتە هۆی لەکەداربوونی.

٥/جنێودان و توانجی ناڕەوا و ناوزڕاندن.

٦/هەر بابەتێك زیان بە ڕێکاری لێکۆڵینەوە و دادوەری بگەیەنێ،تەنیا مەگەر دادگا ڕێگەی بەبلاۆکردنەوەی دابێ.

٧/پێشێلکردنی پرەنسیپەکانی بەڵێننامەی(میپاق الشرف)ی فدراسیۆنی نێودەوڵەتی ساڵی (١٩٥٤)ی هەمارکراو کە پاشکۆی ئەم یاسایەیە.

هەروەها ڕۆژنامەی بلاۆکەرەوەش بەبڕێك پارە غەرامە دەکرێت کە لە(٥٠٠٠٠٠٠)ملیۆن دینار کەمتر و لە(٢٠٠٠٠٠٠٠)ملیۆن دینار پتر نەبێت،ئەگەر یەکێك لەوانەی لەبڕگەی (یەکەم)دا هاتووە بلاۆکردەوە.

**چەند راو سەرنجێك دەربارەی یاسای ڕۆژنامەگەری کوردستان**

یاسای ڕۆژنامەگەری کوردستان بە شکلی ئێستای یەکێکە لە یاسا پێشکەوتووەکانی ناوچەکە،وەلێ ئەوە مانای ئەوە نییە کامل و بێ کەموکوڕییە،کەموکوڕییەکانی یاسای نێوبراو

بەگشتی خۆی لە لاوازی داڕشتن و مەتاتی و ناڕوونی هەندێك لەبڕگە و مادده یاساییەکان دەبینێتەوە ،

هەڵوەستەکردن لەسەر ماف و ئیمتیازات و ئەرکەکانی رۆژنامەنووس لە یاسای رۆژنامەگەری کوردستان و مەرجەکانی دەرکردنی رۆژنامە لە هەرێمدا، دەمانگەیەنێتە ئەو راستییەی کە رۆژنامەنووس لە هەرێمی کوردستاندا تەواو ئازاد نیە،بەلاّم تا رادەیەکی فراوان پانتایی ئازادی و رادەربڕینی بۆ مەیسەرکراوە،هەمووارکردنەوەی یاسای رۆژنامەگەری لە ساڵی ٢٠٠٧ هەنگاوێکی باش بوو بە ئاڕاستەی دابینکردنی ئازادی زیاتر و کەمکردنەوەی هەڵە و کەموکورتییەکانی یاساکە،وەلیّ هێشتا پێویستی بە هەمووارکردن و گۆڕانکاری هەیە،راستە لە بڕگەی یەکەمی ماددەی دووەم لەیاسای نێوبراو بەڕوونی ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە رۆژنامەگەری ئازادە و هیچ سانسۆرێکی لەسەر نیە،بەلاّم هەبوونی دەستەواژەکانی(بەرژەوەندی گشتی و یاسای تایبەتمەند و بەپێی یاسا )جەوهەری ئازادی رۆژنامەگەری لە کوردستان دەخەنە ژێر پرسییارەوە،چونکە کەسانێك بە ئاسانی دەتوانن ئەو کەلێنانە بقۆزنەوە بۆ تەسککردنەوەی پانتایی ئازادی رادەربڕین بەکاریبێنن، وێڕای هەبوونی چەندین لاوازی و کەموکورتی دیکە کە لێرەدا جێگەی باسکردنیان نییە.

ئیشکالیەتی هەرە دیار لەبەردەم یاسای رۆژنامەگەری و سەندیکای رۆژنامەنووسان ئەوەیە کە تەواوی یاساکە بۆ رێکخستنی کاری کارمەندانی ئەو رۆژنامەنووسانە نووسراوە کە لە بواری نووسراودا کاردەکەن،و کارمەندانی بواری بینراو و بیسترا و (رادیۆ و **tv**)و ئەلیکترۆنی لەخۆناگرێت،لە کاتێکدا بەشی سەرەکی ئەندامانی سەندیکا کارمەندانی رادیۆ و تەلەڤزیۆنەکانن.لەڕاستیدا دامەزراندنی سەندیکا یان کۆمەڵەی رۆژنامەوانی تایبەت بە کارمەندانی رادیۆ تەلەڤزیۆنەکان،هاوشێوەی ولاّتانی دیکە زەرورەتێکی هەنوکەییە نەخاسمە کە رۆژانە ژمارەی رادیۆ و تەلەڤزیۆنەکان لە زیادبوون دایە،ئەمە وێڕای ئەوەی جۆری کارمەندانیان و شێوازی کارکردنیان زۆر لە شێوەی کاری کارمەندانی رۆژنامە و گۆڤارەکان جیاوازترە.

# دەرووی چوارەم

## بنەماکانی ئیتیکی رۆژنامەوانی

### بەشی یەکەم:

**بنەماکانی،بەرپرسیارییەتی،دادوەری،ئازای،تایبەتمەندی،سەربەخۆیی.**

### بەشی دووەم:

**بنەماکانی راستگۆیی ودیقەت،بێلایەنی،پاراستنی نهێنی،بابەتیەت، دەستپاکی**



## بەشی یەکەم

### بنەماکانی بەرپرسیارییەتی،دادوەری،ئازادی،تایبەتمەندی،سەربەخۆیی

بنەما ئیتیکییەکان کۆڵەگە هەڵگری ئەخلاقی کاری میدیایین،جەوهەری ئیتیك و کرۆکی ڕێکخستنی پیشەی ڕۆژنامەگەرین،ئەو بنەمایانە رایەڵەی ڕێز و متمانەی نێوان ڕۆژنامەگەری و جەماوەر بەهێز دەکەن،بەردەوامی ڕێز و متمانەش لە نێوان خوێنەر و جەماوەر زامنی ئازادی میدیان،لە دونیادا سەندیکا و ڕێکخراو و دەستە ڕۆژنامەوانییەکانی وڵاتان بەتایبەت لە ئەوروپا و ئەمریکا چەند بنەمایەکی ئیتیکییان دەسنیشانکردووە،بەڵام هەرە گرنگ و دیارەکەیان، بنەما ئیتیکییەکانی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکانی ئەمریکایە کە لەم دەرووەدا تیشکی دەخەینە سەر.

### یەکەم:بنەمای بەرپرسیارییەتی:

ئامانجی سەرەکی لە کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و گەیاندنی بە جەماوەر،خزمەتکردنی رەفاهیەتی گشتی و بەرچاوڕوونکردنی جەماوەرە دەربارەی ئەو ڕوودا و پێشهاتانەی لە نێوخۆی وڵات یان دونیادا ڕوودەدەن،تا دواجار ببێتە خاوەن بڕیاری خۆی لە هەڵسەنگاندنی ڕوودا و پێشهاتەکان.

ڕۆژنامەنووس خاوەن بەرپرسیارییەتێکی ئەخلاقی مەزنە بەو پێیەی بەرپرسیارییەتی گەیاندنی هەواڵ و ڕووداوەکانی دەکەوێتە ئەستۆ بەشێوەیەکی بێلایەنانە و بێ دەسەتکاریکردن، ئەو ڕۆژنامەنووسانەی خۆیان بە نوێنەری کۆمەڵگە دەزانن بەڵام پیشەکەیان بۆ بەرژەوەندی تایبەت و هەڵپەرستی و خۆپەرستی دەقۆزنەوەو بەکاریدەهێنن،ئەوا متمانەی جەماوەر لەدەست دەدەن و خیانەت لەخۆیان و پیشەکەیان دەکەن،کە بێگومان ئەو کارەیان رەنگدانەوەی نێگەتیڤی ڕاستەوخۆی لەسەر ڕای گشتی و دید و ڕوئیای جەماوەر دەبێ بۆ هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان.

هەوڵەکانی ڕۆژنامەگەری و میدیاکاران لەپێناو وەدەستهێنانی ئازادی تەنها بۆ ئەوە نییە ببنە سەرچاوەی گەیاندنی هەواڵ،و بڵندگۆی دیالۆگ و راگۆڕینەوە،بەڵکە لە پێناو ئەوەشە ببنە نموزەجێکی ئەوتۆ کە جەماوەر و دەسەڵات حیسابی تایبەتیان بۆ بکەن،هەر لێرەوەش مەسەلەی بەرپرسیارییەتی ڕۆژنامەنووس هەستیاری و گرنگییەکەی زیاتر بەرجەستە دەبێ.

وەسفکردنی کاری رۆژنامەگەری بە(دەسەلاتی چوارەم) مانای ئیقرارکردنە بە کاریگەری رۆژنامەگەری لەلایەك و بوونی بەرپرسیارییەتێکی ترسناکە لەلایەکی دیکەوە،لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا میدیا لە رێگەی پێدانی هەواڵ و زانیاری یارمەتی دەنگدەران دەدات بۆ هەڵبژاردنی کەسی شیاو،دوای هەڵبژاردنیش چاودێری هەڵبژێردراوان دەکات،بێگومان ئەو کارەش وەك چۆن دەسەلاتە لە هەمانکاتدا بەرپرسیارییەتیشە،خیانەتکردنیش سەرلەبەری پرۆسەی بەرپرسیارییەتی و دەسەلات هەڵدەوەشێنێتەوە،لەو حاڵەتەشدا رۆژنامەگەری لە توخمێکی بونیادنـــەرەوە بۆ توخمێکی وێرانکەر دەگۆڕێت.

کەواتە دەکرێ بڵێین"مەبەست لە بەرپرسیارییەتی هەستکردنی رۆژنامەنووسە بەو رۆڵە کۆمەلایەتییەی جەماوەر پێی بەخشیووە،کۆمەلایەتیبوونی رۆژنامەنوسیش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە ببێتە وەرگر و گەیەنەرێکی راستگۆ و بە ویژدانی داخوازییەکانی کۆمەڵگە بە حکومەت و حکومەتیش بە کۆمەڵگە.

سەرجەم کارمەندانی راگەیاندن،بەتایبەت ئەوانەی بەشداری لە پرۆسەی کۆکردنەوە و بلاوکردنەوەی هەواڵ دەکەن، لە دەسەلات و بەرپرسیارییەتی رۆژنامەگەری بەشدار و بەرپرسیارن،کە ئەوانیش پەیامنێر و وێنەگر و نووسەر و سەرنووسەر و بلاوکەر و سکرتێری نووسینن. نووسەر و سەرنووسەران بوارێکی فراوانیان لەبەردەستدایە گەر بیانەوێ دەستکاری هەواڵ بکەن، پەیامنێرانیش بەهەمان شێوە دەتوانن تەرکیز لەسەر چەند هەواڵێك بکەن،هەندێکی دیکەش فەرامۆش بکەن،یان لەکاتی گەیاندنی هەواڵدا گرنگی بەلایەنێکی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان بدەن و ئەوانی دیکە پەراوێزبخەن،یان لەرێگەی ناونیشان و شوێنی دانانی هەواڵەکان بەرژەوەندیی خۆیان یان کەسانێکی دیکە بەرجەستەبکەن.

سەرنووسەر و بەرپرسی لاپەڕەکان بەبەراورد لەگەڵ کارمەندانی دیکەی رۆژنامە دەستیان کراوەترە لە بەکارهێنانی دەسەلاتی رۆژنامەوانیان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ،بۆنموونە:

بەرپرسی لاپەڕەیەك لەبەرامبەر وەرگرتنی موچەی مانگانە لەلایەن کۆمپانیایەکەوە ،ئەو ماوەیە بایەخێکی زۆری بە پرۆژەوە و چالاکییەکانی کۆمپانیاکە دەدا و بەشێوەیەکی بەردەوام هەواڵەکانی بلاودەکردەوە.

نووسەرێکی وەرزشیش بۆ تۆڵەسەندنەوە لەو یاریزانەی کە ئامادەنەدەبوو لە ژووری خۆگۆڕین لێدوانی بۆ بدات،لاپەڕەکەی قۆستەوە بۆ هێرشکردنە سەر ئەو یاریزانەو بلاوکردنەوەی هەواڵی نەشیاو دژی یاریزانەکە.

شکل و شێوازەکانی خۆدزینەوەی میدیا لە بەرپرسیارییەتی زۆرن،بەتایبەت لەو بەرپرسیارییەتیانەی کە تایبەتن بە بەیانکردنی ئەدای حکومەت یان ئیدارەی شارەکان بەرامبەر بە جەماوەر،بۆنموونە زۆرجار رۆژنامەکان بەتایبەت رۆژنامە بچووکەکان،لە پێناو پارستنی چەند بەرژەوەندییەکی کەسی، یان لەپێناو زامنکردنی گرێبەستە بازرگانییەکانی پڕوپاگەندەکردن،چاو لە بلاۆکردنەوەی ئەو کوموکورتیانە دەپۆشن کە لە کەرتی خزمەتگوزاری یان پەروەردەی شارەکان هەیە و خۆیان و جەماوەر بەبلاۆکردنەوەی هەواڵی رۆتینی و سادە سەرقاڵدەکەن،لەم حاڵەتەدا رۆژنامەکە پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی و بودجە داراییەکەی دەکات،بەلاٌم ئەرکە بنەڕەتییەکەی رۆژنامەگەری ئەدا ناکات.

## بارودۆخە سەختەکان پێویستیان بە بڕیاری سەختە

زۆجار سەرنووسەر و بەرپرسی لاپەڕەکان بەتایبەت ئەوانەی راسپێردراون بە چاودێریکردنی ئەدا و چلاکی حکومەت و دامودەزگاکانی، رووبەڕووی بژاردە و هەڵوێستی سەخت دەبنەوە دەربارەی هەندێك زانیاری ترسناك کە راستی لەخۆیان دەگرن،بەلاٌم لەوانەیە بلاۆکردنەوەیان زەرەر بە ئاسایشی نەتەوەیی بگەیەنێت،لەم حاڵەتەدا دەبێ رۆژنامەنووس چیبکات؟ئایا بلاۆیان بکاتەوە یان بەنهێنی هەڵیان بگرێت؟

لە حاڵەتی جەنگدا میدیا خۆی بەدوور دەگرێت لە بلاۆکردنەوەی وردەکاری دەربارەی سوپا و کەشتیگەلە دەریایی و ئاسمانییەکان،بەلاٌم بەمەبەستی بەرچاوڕوونکردنی هاولاٌتیان و ئاستی تێوەگلانی ولاٌتەکەیان لە جەنگدا، زانیاری دەربارەی ژمارە و قەبارەی هێزە نیشتمانییە بەشداربووەکان بلاۆدەکاتەوە.

بۆ نمونە ساڵی ١٩٦١ بەر لە ئەنجامدانی پرۆسە سەربازییە بەناوبانگەکەی دەستگای هەواڵگری ئەمریکا لەژێر ناوی(کەنداوی بەرازان)دژی ولاٌتی کوبا،رۆژنامەی (واشنتۆن پۆست)وردەکاری تەواوی دەربارەی ئەو هێرشە لابوو و،راپۆرتە هەواڵێکی تێر و تەسەلیشی لەبارەیەوە ئامادەکردبوو،بەلاٌم کاتێك سەرۆك(کنێدی)سەرۆکی ئەوکاتی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داوای لە سەرنووسەری (واشنتۆن پۆست)کرد راپۆرتەکە بلاۆنەکاتەوە بەبیانووی ئەوەی دەچێتە خانەی درکاندنی زانیاری هەواڵگری،و کاردەکاتە سەر ئەمنی نەتەوەیی،رۆژنامەکە بلاۆکردنەوەی راپۆرتەکەی راگرت و تەنها وەك زانیاری پێشبینیکرا و لە هەواڵێکی کورتدا بلاۆیکردەوە،بەمجۆرە جەماوەر لە وەرگرتنی هەواڵێکی موحەقەق و گرنگ بێبەشکرا،بەلاٌم بلاۆکردنەوەشی لەوانەبوو کاربکاتە سەر ئاسایشی نیشتمانی ئەمریکاو لەباربردنی کردە سەربازییەکە.

ساڵی ١٩٧٩ کاتێك هێزە سەربازییەکانی ئێران ،واتە پاسەوانانی شۆڕشی ئیسلامی هەڵیانکوتایە سەر باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران و کارمەند و دیپلۆماتکارانی باڵوێزخانەکەیان دەسبەسەرکرد،زۆربەی رۆژنامە و رادیۆ و ئاژانس و تەلەڤزیۆنەکانی ولاٌتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا زانیاری دروستیان لەسەر هەلاٌتنی شەش کارمەندی باڵیۆزخانەکە هەبوو بۆ باڵیۆزخانەی کەنەدا ،بەلاٌم هیچ کام لە رۆژنامە و دەزگا ئیعلامیەکانی ئەمریکا ئەو هەواڵەیان بلاٌونەکردەوە تا ئەو کاتەی کەنەدییەکان توانیان لە ئێران رزگاریان بکەن و بیانگەیەننەوە ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

هەر لەهەمان ساڵدا،رۆژنامەی (برۆجیسیف)پێشنیاری بلاٌوکردنەوەی وتارێکی کرد دەربارەی چۆنیەتی دروستکردنی بۆمبی هایدرۆجینی،دەسەلاٌتدارانی ئەمریکا زۆر بەتووندی بەرامبەر ئەم پێشنیارە وەستان،بەبیانوی ئەوەی ئەم بابەتە بابەتێکی ترسناکە ،یارمەتی خەڵکی بەتایبەت کروهە چەکدارەکان دەدات بۆ دروستکردنی بۆمبی لەمجۆرە،لەم سەروبەندەدا نێوەندی رۆژنامەوانی ئەمریکاش بەسەر دوو بەش دابەش بوو،یەکێکیان هاوڕابوو لەگەڵ بۆچوونەکانی حکومەت،ئەویدیکەشیان پێی وابوو مەسەلەیەکی ئاساییە چونکە پێشتر زانیاری لەمشێوەیە بلاٌوکراوەتەوە،بەلاٌم تەواوی رۆژنامەنووسانی ئەمریکا لەسەر ناڕەوایەتی پەنابردنی حکومەت بۆ دادگا کۆکبوون بەمەبەستی رێگەگرتن لە بلاٌوکردنەوەی وتارەکە.

گومان لەوەدا نییە کە رۆژنامەنووسی راستەقینە هەرگیز کاری وەها ناکات ژیانی خەڵکی بخاتە مەترسییەوە،بەلاٌم زۆرجار دەسەلاٌتداران بەبیانووی ئاسایشی نەتەوەییەوە رێگری لە بلاٌوکردنەوەی ئەو زانیاری و هەوالاٌنە دەکەن کە ئیحراجی و شەرمەزارییان بۆ دروستدەکات،بەلاٌم پرسی پاراستنی ئەمنی نەتەوەیی دەکەن بە بیانوو،هەر ئەمەشە زۆرجار رۆژنامەنووسان رووبەڕووی هەڵوێستی سەخت دەکاتەوە کە پێویستی بە بڕیاری سەختە.

زۆرجار ئەو هەڵمەتە رۆژنامەوانیانەی دەزگاکانی راگەیاندن دەربارەی پرسێك رایدەگەیەنن لەوانەیە بەچاکە و خێر بەسەر بەرژەوەندی گشتیدا بشکێتەوە و خزمەتی کۆمەڵگە بکات،بەلاٌم پرسیاری گرنگ لەو بابەتە کە پەیوەندارە بە مەسەلەی ئەخلاٌقیاتی کارکردن ئەوەیە ئایا هەموو کەرەستەو شێوازێك رێپێدراوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری،بەتایبەت لەو کاتنەی کە رۆژنامەنووس رۆڵی ئەکتەرێکی درۆزن دەبینێ ؟؟بۆ نموونە جارێك کۆمەڵە رۆژنامەنووسێکی رۆژنامەی (شیکاگۆ سەن)هەڵسان بە بینینی رۆڵی پیاوانی خاوەن کار، کاتێك لەبەردەم فەرمانبەرانی چاودێری تەندروستیدا وەك خودان باڕەکانی مەی فرۆشتن خۆیان نیشاندا،ئەو رۆژنامەنووسانە

بەهۆی ئەم رۆڵبینینەوە و لەرێگەی بەڵگەی زیندوو و تۆماری وێنەییەوە،گەندەڵی هەندێك لەو فەرمانبەرانەیان نیشاندا کە بەرامبەر برێك پارە چاوپۆشیان لە کەموکوڕیەکانی باڕەکان دەکرد، بلاۆکردنەوەی ئەو زانیارییانە لە رۆژنامەی (شیکاگۆ سەن)پەرچەکرداری جیاوازی لەلایەن رۆژنامەنووسانەوە بەدوای خۆیدا هێنا،هەندێکیان بە کردارێکی بوێرانە و گرنگیان وەسفکرد لە پێناو وەدەستهێنانی زانیاری،لە بەرامبەردا هەندێکی دیکە بە لادان لە بنەما ئەخلاقییەکانی پیشەی رۆژنامەگەریان دانا.

لەزۆر شوێن و کاتی دیکەدا،بەتایبەت لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رۆژنامەنووس لەپێناو وەرگرتنی زانیاری لە سەرچاوەکانی هەواڵ،بە تایبەت لەو پرسانەی گرنگ و هەستیارن،رۆڵی پۆلیس یا سەرباز یان فەرمانبەر یان ئەندازیاری بینیووە و ئەو کارەی پەرچەکرداری جۆراوجۆری بەدوای خۆیدا هێناوە.

زۆرینەی رۆژنامەنووسان لەسەر ئەوە کۆکن ،رۆڵبینینی رۆژنامەنووس وەك فەرمانبەر یان ئەندازیار....تاد بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەرچاوەکانی هەواڵ و کۆکردنەوەی زانیاری هەستیار لەپێناو خزمەتگەیاندن بە جەماوەر کارێکی رۆژنامەوانی دروستە و ناکۆك نییە لەگەڵ بنەما ئیتیکییەکانی پیشەکە،بەوپێیەی رۆژنامەنووس لەپێناو بەرژەوەندی گشتی نەك تایبەتی خۆی ئەو رۆڵەی بینیووە،بەمەرجێك لە میانی ئەو رۆڵبینینەیدا زیان بەر خەڵکی بێوەی نەکەوێت.

پەیماننامەی کۆمەڵەی سەرنووسەرانی رۆژنامەکانی ئەمریکا جەخت لەسەر وردبینی و بەدواداچوونی ئیش و کارەکانی حکومەت و هێزە خاوەن نفوزەکانی کۆمەڵ لە کۆمپانیاو پیاوانی کار دەکات،لەم روانگەیەوە بەشێکی زۆر لە رۆژنامەکان کەوتنە چاودێریکردنی ئەو کارگەو کۆمپانیایانەی هۆکاری پیسکردنی ژینگەن،یان لە فرۆشتنی کەلوپەلی خۆراك فێڵ لە بەکاربەر دەکەن،هەروەها کەوتنە چاودێریکردنی ئەو سەندیکا پیشەییانەی بە شێوازی جۆراوجۆر هەوڵی فێرکردن لە کرێکارە ئەندامەکانیان دەکەن بۆ بەرژەوەندی سەرمایەدار و خاوەن کارەکان،بەلاّم رۆڵبینینی رۆژنامەگەری وەك رەقیب بەسەر کەرتی تایبەت و خاوەن نفوزانی ئەو بوارە زۆرجار جێگەی شەك و هەڵوەستەکردنە،لەوانەیە زۆرجار خوێنەر بە سەرسوڕمانەوە بپرسێت،گەر رۆژنامەیەك یان هەر دەزگایەکی دیکەی راگەیاندن لەلایەن کۆپانایییەکی زەبەلاحی نەوت دەرهێنانەوە یارمەتی و تەمویل بکرێت، چۆن دەتوانێ بەوردی کار و چالاکییەکانی چاودێری بکات،یان هەڵە و سەرپێچییەکانی ئەو کۆمپانیایە بخاتە روو؟؟نووسەر و پەیامنێرانی ئەو جۆرە رۆژنامانە لەوانەیە بەشێوەیەکی لاشعوری بکەونە ژێر

کاریگەری نفوزی ئەو کۆمپانیایەی خاوەندارێتی رۆژنامەکەیان دەکات،هەروەها لەوانەیە هەستی ئەوەیان لا چەکەڵە ببێ کە ناکرێ زۆر پەی بەو بابەتانە ببەن کە پەیوەندیان بە پیشەسازی نەوتەوە هەیە.

سەبارەت بە بلاْوکردنەوەی هەواڵی ئەو کۆمپانیایانەی خاوەندارێتی رۆژنامەکان دەکەن،پێویستە نووسەر و سەرنووسەرانی رۆژنامەکان وردبین بن لە بلاْوکردنەوەیان،هەندێك هەواڵ خۆی لەبنەڕەتدا مەشروعیەتی بلاْوکردنەوەیان هەیە،بەلاّم هەندێکی دیکە،بەتایبەت ئەوانەی بۆنی پڕوپاگەندەو رێکلامیان لێدێت،دەبێ ستافی رۆژنامەکە بە ئاگاییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکات و بلاْویان نەکاتەوە،چونکە بەپێچەوانەوە مسداقیەتی رۆژنامەکە لای جەماوەر دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

بەکورتی،بەرپرسیارییەتی میدیا بەرامبەر رای گشتی و جەماوەر لەلایەك و ،بەرامبەر بەرژەوەندییە گشتییەکان لەلایەکی دیکە،بەرپرسیارییەتێکی مەزن و هەستیارە،هەر رۆژنامە و میدیاکارێك نەتوانێ لە ئەستۆی بگرێت، ئەوا رۆڵە چاودێرییەکەی وەك ئەو سەگانەی چاودیریکردنی لێدێت کە بێ چڕنووك و ددانن.

## دووەم:بنەمای دادوەری

دادوەری بنەمایەکی رەسەنی بنەماکانی ئیتیکی کاری میدیاییە،پێویستە رۆژنامەنووس لەکاتی رووماڵکردن و گواستنەوە و بلاْوکردنەوەی بابەتە رۆژنامەوانییەکان،رەچاوی دادوەری و یەکسانی بکات،و بە شێواز و زمانێکی ئەوتۆ بلاْویان بکاتەوە ،سەرنجی خوێنەر کێش بکات،هاوکات تاوان و کاری دزێو بە تایبەت(تاوانە سێکسییەکان،و تیرۆر و تۆقاندن) بە شێوە و زمانێکی ئەوتۆ بخاتەڕوو ئەنجامدانی کاری تاوانکاری لای خوێنەر ناشیرین بکات،رەچاوکردنی پێوەری دادوەری بۆ تەواوی ژانرە رۆژنامەوانییەکان پێویستە.

## سێهەم: بنەمای ئازادی

ئازادی رۆژنامەگەری لە پێناو خزمەتی کۆمەڵگەیە،بۆیە پێویستە پارێزگاری لێبکرێت لەهەر جۆرە دەستدرێژیکردنێکی گشتی و تایبەت ،لە لایەن هەر کەس و گروپێکەوە ئەنجام بدرێت.ئازادی رۆژنامەگەری شیاوی دەستتێوەردان نییە،چونکە مافی میللەتە،ئازادی رۆژنامەگەری واتای کۆمەڵگەی ئازاد دەگەیەنێت.

بەرگریکردن لە ئازادی رۆژنامەگەری ئەرکێکی دانەبڕاوە لە ئەرکەکانی پیشەی رۆژنامەگەری،بۆیە زۆربەی رۆژنامەنووسان بەئەرکی خۆیانی دەزانن بەرگری لە ئازادی پیشەکەیان بکەن.

بەرگریکردن لە ئازادی رۆژنامەگەری کارێکی ئاسان نییە،زۆرجار بەهۆیەوە رۆژنامەنووسان تووشی ناخۆشی و گرفت دەکاتەوە،بۆنموونە کاتێك سەرۆکی شارەوانی یان هەر فەرمانگەیەکی دیکە رێگری لە رۆژنامەنووسێك دەکات بۆ ئامادەبوون لە کۆبوونەوەکانی فەرمانگەکە،پێویستە ئەمە قەبوولّ نەکات،ئەگەر هەر رێگەی پێنەدرا لە کۆبوونەوەکە بەردەوام بێ،دەبێ دوای نارەزایەتیەکی توند ئینجا کۆبوونەوەکە جێبهێڵێ،و سەرنووسەر و بەرپرسی لاپەڕەکەی لەو رێگرییە ئاگادار بکاتەوە،پێویستە ئەوانیش لای خۆیانەوە دەست بەجموجۆڵ بەکەن،سەرەتا دەبێ پەنا ببەنە بەر یاسا ،گەر لە یاسادا مافی کرانەوەی کۆبوونەوەکان بۆ جەماوەر زامن کرابوو،ئەوا بەئاسانی کێشەکە بەسوودی رۆژنامەنووسەکە یەکلادەبێتەوە،ئەگەر ئەو مافەش لە یاسا ئاماژەی بۆنەکرابوو،رۆژنامەکە لەرێگەی هەواڵ و راپۆرت و وتارەوە دەتوانێ گوشار بخاتە سەر بەڕێوەبەری فەرمانگەکە تا لەبڕیارەکەی پەشیمان ببێتەوە .

ساڵی ١٩٨٠ پارێزگاری ویلایەتی شیکاگۆی ئەمریکا(جۆن بیرین)لە هەوڵێکی نەزۆکدا ویستی رۆژنامەنووسێکی رۆژنامەی (شیگا جوتریبۆن)بترسێنێ لە رێگەی بڕیاری دەرکردنی لە ژورێکی فەرمانگەی شارەوانی کە بۆ رۆژنامەنووسان تەرخانکرابوو،لەگەڵ ئەوەی بەپێی یاسا (جۆن بیرین)مافی ئەوەی هەبوو ژوورەکە لەو رۆژنامەنووسە وەرگرێتەوە چونکە سەر بە مومتەلەکاتی دەوڵەت بوو،بەلاّم رۆژنامەنووسەکە رووبەڕووی بۆوە و بڕیارەکەی جێبەجێنەکرد،رۆژنامەکەش دەستی کرد بە بلاّوکردنەوەی هەواڵ و راپۆرت دەربارەی ئەو بڕیارە و پاڵنەر و ئاسەوارەکانی،تا وایلێهات سۆزێکی جەماوەری و رۆژنامەگەری دەربارەی ئەم مەسەلەیە دروست بوو،رۆژنامەنووسانی دیکەی شارەکەش کەوتنە هەواڵ و وتار نووسین دەربارەی،تا دواجار پارێزگار لە بڕیارەکەی پاشگەز بووەوە و سەرکەوتن بۆ رۆژنامەنووسان تۆمار کرا.

حاڵەتی دیکەی هاوشێوە زۆرن کە کەس و لایەنی گشتی و تایبەت،بەتایبەت کاربەدەستانی دەوڵەت ویستویانە لە رێگەی ترساندن و شێوازی جیاجیا ریگەنەدەن رۆژنامەنووسان بگەنە سەرچاوەکانی زانیاری و لە پەیامەکەیان دووریان بخەنەوە،بەلاّم بەشی زۆری ئەو هەولاّنە نەزۆك و بێ ئەنجام دەرچوونە،چونکە رۆژنامە و رۆژنامەنووسان دوودڵ نەبوونە لە بلاّوکردنەوەی گەڤ و

هەڕەشەكان بۆ رای گشتی ،كە دەرئەنجام بەهۆی پەیڕەوكردنی ئەو سیاسەتە سۆزی جەماوەریان كەسب كردووە و سەركەوتنیان وەدەستهێناوە.

كەواتە باشترین میكانیزمی رۆژنامەنووس بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەسدرێژیكردنە سەر ئازادییەكانی،راگەیاندنی لایەنی هەڕەشەكە و ناوەڕۆك و ئامانجەكانیەتی بۆ رای گشتی،لەم جۆرە پرسانەدا رای گشتی خزمەتێكی گەورەی رۆژنامەنووسان دەكات،باشترین چەكی بەرەنگاربوونەوەی دەستیانە.

هەندێك لە بیرمەندانی میدیا پێیان وایە كارێكی باش نییە هەموو كات و بۆ هەموو پرسێك راگەیاندن پەنا بباتە بەر چەكی رای گشتی بۆ بەرگریكردن لەخۆی،چونكە زۆر بەكارهێنانی لەوانەیە ببێتە هۆكاری خۆخواردنەوەو چروك بوونی.پێویستە راگەیاندن رەخنەی بونیادنەدەر قەبووڵ بكات گەر لەلایەن فەرمانبەرانی دەسەڵاتەوەش بوو،چونكە جیاوازی هەیە لە نێوان رەخنەو دەتسدرێژیكردنە سەر ئازادی رۆژنامەوانی،راستە گورگەكانی دژ بە ئازادی هەموو كات لە بۆسەدان بۆ قووتدانی ئازادییەكان،بەڵام نابێ رۆژنامەگەری هەموو نەیاران بە گورگ بشوبهێنێ.

لە چەند ساڵی رابردوودا لە ولاًتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا كۆمەڵێك ئاژانس و نێوەندی یاسایی ،بەتایبەت داواكاری گشتی هەولًیاندا رۆژنامەگەری وەك كەرەستەیەك لە پرۆسەی لێكۆڵینەوە و دادوەری بەكاربێنن،بە تایبەت لە رووداوەكانی تاوان كە زۆرجار رۆژنامەنووسان زانیاری و بەڵگەی ئەوتۆیان دەستدەكەوت نەدەكەوتە ژێر دەستی لێكۆڵەرانی دادی،كاتێكیش هەر دەزگایەكی رۆژنامەوانی ئەو وردەكارییە گرنگانەی بلاًودەكردەوە،دادگا رەخنەی توندی ئاراستە دەكرد تا رادەی لێكۆڵینەوە و لێپێچینەوە،لەم نێوەندەدا و لە پێناو دەستبەسەرداگرتنی دادگا بەسەر ئەو زانیارییە وردانە دیاردەی دەركردنی بڕیاری دادوەری هاتە كایەوە كە بەهۆیەوە دەسەلاًتی جێبەجێكار بۆی هەبوو زانیارییە وردەكان لە رۆژنامەنووسان وەربگرێت،بۆنموونە تەنها لە ساڵێكدا نزیكەی (٥٠٠)بڕیاری لەوجۆرە دەرچوو كە بەزۆری و بێ ویستی رۆژنامەنووسەكە زانیاری و وێنە گرینگەكانی لێوەردەگیرا،ئەم كارە نارەزاییەكی گەورەی لە نێوەندی رۆژنامەگەری لێكەوتەوە،تا دەرئەنجام كۆنگرێسی ئەمریكی ساڵی ١٩٨٠ پرۆژە بڕیارێكی ئیقرار كرد كە دواتر لە لایەن سەرۆك كارتەریشەوە واژوو كرا،بەهۆیەوە هەموو شێوەكانی هەڵكوتانەسەر و گەڕانی لەنێو كەل و پەلە رۆژنامەوانییەكانی راگەیاندنكاران

قەدەغە کرد،بەڵام هێشتا بەشێوەیەکی بنبڕ لە ژێر ناو و فاکتەری جیاجیا کۆتایی بە بڕیارە دادگاییەکانی پەیوەست بە وەرگرتنی زانیاری بەشێوەی زۆرەملێ نەهێنا.

راستە بەپێی یاسا پێویستە هەموو کەسێك لەپێناو چەسپاندنی دادوەری گەر دادگا بە پێویستی زانی دەبێ لەبەردەم دادوەر ئامادەبێ و گەواهی بدات،ئەمە بۆ هاولاٚتییەکی ئاسایی هیچ کێشەو گرفتێك نیە،بەلاٚم بۆ رۆژنامەنووس کارێکی زەحمەتە چونکە ئەو ئەرکی پارێزگاریکردن لە ئازادی رۆژنامەوانی لە ئەستۆدایە و هاوسەنگیکردن لە نێوان ئەرکی پیشەکەی و یارمەتیدانی دادگاکان کارێکی تارادەیەك زەحمەتە،بۆیە لە هەندێ حاڵەتدا رۆژنامەکان لەرێگەی یاساوە رووبەڕووی بڕیارەکانی دادگا وەساونەتەوە و لە کۆتاییدا سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە و نەچوونەتە بەردەم دادوەر،لەهەندێك حاڵەتی دیکەشدا تواندراوە چارەسەری مامناوەندی بدۆزرێتەوە.

بەلاٚم لە هەندێك حاڵەتی دیکەدا بەهۆی ئامادەنەبوونی رۆژنامەنووس لە دادگا و نەدانی زانیاری ،دادگا تۆمەتی هاوکارینەکردن و کەمکردنەوە لە هەیبەتی دادگای خستۆتە پاڵ رۆژنامەنووسان و بەهۆی ئەو تۆمەتەوە دەستگیر کراون.

هەندێك دەزگای رۆژنامەنووسیش لە ترسی هەڵکوتانەسەری لەناکاو،دەزگاکانیان لەسەرجەم ئەو دۆکۆمێنت و پەڕاو و وێنانە خالی دەکەن کە لەوانەیە دادگا بڕیاری دەستبەسەرداگرتنیان بدات،رۆژنامەنووسان بەهەموو شێوەیەك بەرەنگاری ئەو هەولاٚنە دەبنەوە کە دەیانەوێت رۆژنامەگەری بکەنە بەشێك لە مەنزومەی لێکۆڵینەوەی دادی و وەدەستهێنانی زانیاری گرنگ لە رێگای میدیاوە،چونکە ئەمە ئەرکی ئەوان نییە و دادگا بۆی هەیە بە شێوازی دیکە بگاتە ئەو زانیاری و بەڵگانە.

## شێوەکانی ئیستیغلاکردنی رۆژنامەگەری

ماددەی دووەم لە بەیاننامەی کۆمەڵەی سەرنووسەرانی رۆژنامەکانی ئەمریکا تایبەت بە ئیتیکی کارکردن، هانی رۆژنامەنووسان دەدات وریا و بەئاگابن لە هەوڵەکانی ئیستغلاکردنیان،بەیاننامەکە کەس و شێوازەکانی ئیستیغلاکردنی رۆژنامەنووسان لە چەند خاڵێك کۆدەکاتەوە:

- سیاسەتکار و سەرۆکی حیزبەکان،لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا،لەپێناو پڕوپاگەندەکردن بۆخۆیان،کۆبوونەوەی تایبەت بۆ رۆژنامەنووسان رێکدەخەن،لە کۆبوونەوەکەدا هەندێك زانیاری گوماناوی و هەواڵی بێ بنەما بە رۆژنامەنووسان دەدەن و لەمیانی پێدانی ئەو زانیارییانە بە

شێوەیەکی ناڕاستەخۆ تەرویج و بانگەشە بۆخۆیان لیستەکانیان دەکەن،پێویستە رۆژنامەنووس بەئاگابێ لەو هەولانە و نەبێتە بەشێك لە ماکینەی ئیعلامی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنی سیاسییەکان.

- هەندێ جار خۆپیشاندەران لە کاتی ئەنجامدانی چالاکیەکانیان، فێڵ لە رۆژنامەگەری و رای گشتی دەکەن،ئەو کاتەی دەزگا ئیعلامییەکان دەگەنە شوێنی خۆنیشاندانەکە،حالەتێکی حەماسی سەرنجڕاکێش نیشان دەدەن و دەست بە هوتاف و دروشم گوتنەوە دەکەن،یان گشت لافیتە و مۆتۆ و ئالاکانیان بەرزدەکەنەوە و دەجوڵێنن،یان دەستدەکەن بە شکاندنی دەرگاو پەنجەرەی کۆگا و شوێنە نزیکەکانی دیکەی خۆنیشاندانەکە،هەموو ئەو کارانە لەپێناو سەرنجڕاکێشانی رای گشتییە لە رێگەی میدیاوە کە لە شوێنی خۆنیشاندانەکە ئامادەیە و رووداوەکە بۆ جەماوەر دەگوازێتەوە.ئەم حالەتە رێك لە خۆنیشاندانەکانی بەردەم باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران بیندرا کە (٤٤٤)رۆژی خایاند،لەو خۆپیشاندانانەدا کاتێك میدیا ئامادەی رووماڵکردنی دەبوو خەڵکەکە بە حەماس و گوڕوتینێکی زۆرەوە هاواریان دەکرد و هوتافیان دەکێشا و دروشمی دژ بە ئەمریکا و ئیمپریالیزمیان دەگووتەوە،بەلام کە میدیا کارەکانی تەواو دەکردو کۆتایی بە رووماڵکردن دەهێنا،ئیش و کاری خۆنیشاندەانیش تەواو دەبوو و زۆربەی هەرەزۆریان لەگەڵ رۆژنامەنوسان بەردەم باڵیۆزخانەی ئەمریکایان جێدەهێشت.
- هەندێ لە کۆپانیاکانی ئامادەکردنی خۆراك و کەلوپەلی تەندروستی،ئەوانەی یارمەتی بەرپرسی لاپەڕەکانی ئابووری و تەندروستی دەدەن لە رۆژنامەکان،زۆرجار لەکاتی ناردنی زانیاری بۆ ئەو بەرپرسانە،بەشێوەیەکی داپۆشرا و نادیار پڕوپاگەندە بۆ جۆرە خواردنێکی کۆمپانیکەیان دەکەن،دەبێ رۆژنامەنووسان بەوردی چاودێری ئەو جۆرە بابەتانە بکەن تا تووشی هەڵکردن نەبن.

لەهەموو ئەو حالەتانەی ئاماژەمان پێدا رۆژنامەنووسان بەرپرسن لە پاراستنی مسداقییەتی کارەکایان و ئیستیغلانەکردنیان لەلایەن هیچ کەس و ناوەندێکەوە.

ناکرێ رۆژنامەنووس بەچاوی گومانەوە تەماشای هەموو کۆڕ و کۆنفرانسێکی سیاسی و حیزبەکان بکات،لەوانەیە هەندێ جار لەکاتی ئامادەبوونیدا زانیاری و هەواڵی سەرنجڕاکێشی دەستبکەوێت،یان لە میانی قسەکانیان بۆنی شتێکی تازە بکات،یان بیرو بۆچوون و شرۆڤەی سیاسی گرنگی لا دروست ببێ،بەلام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە کۆنفرانسە سیاسییە ئامادەکراو و و مەبەستدارەکانە بە ئامانجی پڕوپاگەندەکردن بۆ کەسایەتیەکی سیاسی یان حیزبێکی

دياريكراو،واتە رۆژنامەنووس مولزەم نييە لە هەر كۆڕ و ميتينگێك ئامادەبوو هەواڵ و راپۆرتی دەربارەی بنووسێ،بەڵكە دەتوانێ هيچ لەبارەيەوە بلاَونەكاتەوە،يان تەنها ئەو قسە و لايەنە بلاَوبكاتەوە كە بەكەڵكی ئەو دێن.

سەبارەت بە خۆنيشاندەرانيش دەكرێ هەمان سياسەت پەيڕەو بكرێ،پێويستە رۆژنامەنووس جياكاری لە نێوان خۆنيشاندەرانی راستەقينە و نا راستەقينە بكات،ئەوانەی تەنها بۆ خۆدەرهێنان لەبەردەم كامێرا و راگشتی خۆنيشاندان دەكەن،بلاَوكردنەوەی هەواڵكی چەند دێڕی لەبارەيانەوە بەسە،بەلاَم ئەوانی ديكە دەبێ رۆژنامەنووس هەڵوەستەيان لەسەر بكا و راپۆرتە هەواڵيان لەبارەيەوە ئامادە بكات.

سەبارەت بە كۆمپانياكانی خۆراكيش،زۆرجار لە زانيارييەكانيان ،رێنمايی خۆراكی بەسوود دەربارەی جۆرەكانی خواردەمەنی تێبينی دەكرێت،پێويستە رۆژنامەنووس بۆ سوودگەياندن بە جەماوەر بلاَويان بكاتەوە،بەلاَم دەبێ وريابێ لە ناونەهێنانی كۆمپانيا بەرهەمهێنەرەكانی خۆراكەكە،تا نەبێتە هۆكاری پڕوپاگەندەكردنی بێ بەرامبەر بۆيان.

هەروەها دەبێ ئاماژە بەوەش بدەين كە هەوڵەكانی ئيستيغلالكردنی رۆژنامەنووس تەنها لە كەسانی دەرەوەی دەزگا رۆژنامەوانييەكانەوە سەرچاوە ناگرێ،بەڵكە هەندێ جار كارمەندان و رۆژنامەنووسانی خودی دەزگاكانيش دەگرێتەوە،وەك ئەوەی رۆژنامەيەك يان رۆژنامەنووسێكی دياريكراو لەگەڵ كانديدێكی هەڵبژاردن رێكبكەوێت لەبری رومالّكردن و بايەخدان بە هەڵمەتی خۆكانديدكردنەكەی،هێرش بكاتە سەر حيزب يان كەسايەتييەكی سياسی نەيار بە رۆژنامەنووس يان دەزگا رۆژنامەوانييەكە،هەروەها رێككەوتنی پێشوەختی رۆژنامەنووس لەگەڵ ئەو كەسانەی كە چاوپێكەوتنيان لەگەڵ ساز دەكات لەسەر جۆر و شكلی پرسارەكان،هەمديس كارێكە دەچێتە خانەی ئيستيغلالكردنی رۆژنامەنووسانەوە.

**چوارەم: بنەمای تايبەتمەندی**

مەبەست لێی لەكەدارنەكردن و نەبەزاندنی ژيانی تايبەتی تاكەكانە كە هەندێجار لە ئەنجامی هەڵە بەكارهێنانی ئازادی رۆژنامەوانييەوە هێرشی دەكرێتەسەر،يان بە دەستی ئەنقەست دەقۆسترێتەوە و خراپبەكاردەهێندرێ،بەتايبەت لە كاتی هەڵمەتەكانی هەڵبژاردندا هەندێ لە پاڵێوراوان وەك چەكێكی كاريگەر دژ بەيەكتری بەكاريدەهێنن.

**پێنجەم:بنەمای سەربەخۆيی**

سەربەخۆیی رۆژنامەنووس بنەمایەکی سەرەکی ئیتیکی کاری رۆژنامەوانییە،زۆر گرنگە رۆژنامەنووس بەوردی چاودێری هەڵسوکەوت و کردارەکانی بێ،نابێ هەڵسوکەوتی وا بکات ببێتە جێگەی گومان و سەرزەنشتی خەڵکی و بە سلبی بەسەر کەسایەتی و پیشەکەیدا بشکێتەوە،هەر کار و چالاکییەکی رۆژنامەوان پێویستە بەئاڕاستەی بەجێگەیاندنی ئەرکە سەرەکییەکەی راگەیاندن بێ کە پێڕاگەیاندن و گەیاندنی زانیارییە بەجەماوەر.

بلاۆکردنەوەی هەر پەیامێکی رۆژنامەوانی سەربەخۆی و مسداقییەتی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە لاگیری و داشکاندنەوە بەلای هیچ کەس و لایەنێك نەکات،رۆژنامەنووسی سەربەخۆ و پرۆفیشناڵ ئەو رۆژنامەنووسەیە خەلاّت و بەرتیل و دیاری و سەفەر و بانگهێشت و داوەت بەخۆڕای و لە بەرامبەر ئەنجامدانی کارێك، لە هیچ کەس و نێوەندێك قەبووڵ ناکات.

زۆرینەی دەزگا رۆژنامەوانییەکان هەموو شێوازێکی کەلوپەل وەرگرتن یان داوەت قەبووڵکردن لە کارمەندانیان حەرام دەکەن، هەرچەندە جۆری ئەو داوەتە یا کەلوپەلە بچووکیش بێ،چونکە پێیان وایە سەرەتای لادان لەشتی بچووکەوە دەستپێدەکات،و تەنها بەربەستێکی باریك لە نێوان خراپە و چاکەدا هەیە،بە پچڕانی ئەو بەربەستە دەرگە لەبەردەم خراپە و لادانی گەورە والا دەبێ،چونکە و هەموو خراپە لادانێکی گەورە لە لادانی بچووکەوە دەستپێدەکات.

هێڵە سوورەکانی بەردەم رۆژنامەنووس زۆر و فراوانن،ئامانج لە داچەقاندنیان لەدەستنەدانی سەربەخۆیی و پیشەگەرییەتی رۆژنامەنووسە،لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرجەم دەزگا رۆژنامەوانییەکان لەسەر چەند هەڵسەوکەوت و کردارێك کۆکن کە دەبێ میدیاکار خۆیان لێ بەدور بگرێ تا پارێزگاری لە سەنگ و سەربەخۆیی خۆی بکات،ئەوانیش بریتین لە:

- سەفەرکردن لەگەڵ شاندە سیاسی و وەرزشییەکان لەسەر خەرجی ئەوان بۆ رووماڵکردنی هەواڵ چالاکییەکانیان.
- لەکاتی ئامادەبوون لە کۆنگرە و کۆنفرانسەکان قەبوڵکردنی میوانداری و داوەتی ئامادەکارانی کۆنگرە.
- ئامادەبوون لەو داوەت و میوانداریيانەی کە دەسەلاّت یان کۆمپانیا و کەرتی تایبەت بە مەبەستی کۆمەڵێك بەرژەوەندی تایبەت بۆ سەرنووسەر و بەڕێوەبەری دەزگا رۆژنامەوانییەکان رێکیدەخات.

- سەفەرکردن لەژێر ناوی کاری ڕۆژنامەوانی لەسەر خەرجی وڵاتێکی وەك ئیسرائیل بۆ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوین،چونکە ئەم جۆرە کارە بێلایەنی ڕۆژنامەنووس دەخاتە ژێر پرسیارەوە لە دیدی ئەو وڵاتانەی کێشە و ململانێیان لەگەڵ ئەو وڵاتە هەیە.
- وەرگرتنی هەر کەلوپەل و کەرەستەیەك کە نرخی ماددی دیاریکراوی هەبێ.

لەراستیدا ڕۆژنامەنووس وەك هەر مرۆڤێکی دیکە بەدەر نییە لە هەڵە ولادان،ئەویش وەك هەر کەسێکی دیکە لەوانەیە بکەوێتە ژێر گوشاری مادده و ئیمتیازاتەوە،بۆیە ناکرێ چاوەڕێی میسالیەت و رەفتاری فریشتانەی لێبکرێ،بەو پێیەی ئەویش بەشێکە لە کۆمەڵگە و لە پەیوەندی کۆمەلاَیەتی ڕۆژانەدایە،جا بەهۆی خوێندنی منداڵەکەی یان کارکردنی خێزانەکەی و ئەندامیەتی لە یانە ڕۆشنبیرییەکان،بێئەوەی هەست بکات،یان بەناچاری هەندێ کار یان هەڵسوکەوت ئەنجام دەدات لەگەڵ ئیتیکی کارەکەی یەکناگرنەوە.

جگە لە ئاستی شەخسی لە ئاستی گشتیشدا زۆر حاڵەت و کردار هەن میسداقیەت و سەربەخۆیی ڕۆژنامەنووس دەخەنە ژێر پرسیارەوە،وەك ئەوەی لەکاتی هەڵبژاردنەکان ڕۆژنامەنووس بە ئاشکرا لاگیری لە پاڵێوراوێکی دیاریکرا و بکات و وێنە و پۆستەرەکانی بە ئۆتۆمبیلەکەیەوە هەڵبواسێ،یان بەهۆی سۆزی بۆ پاڵێوراوێك، یان خزمایەتی لەگەڵی،بەئاشکرا لە وتارەکانی ستایشی بکات و چالاکییەکانی بلاَوبکاتەوە.

لەلایەکی دیکەوە شتێکی قەبوڵنەکراوە کەسێك ئەندامی پارتێکی سیاسی بێ و کاری سیاسی ئەنجامبدات،لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەنووس بێ و لە دەزگایەکی ڕاگەیاندن کاربکات.ئەو ڕۆژنامەنووس و دەزگایانەی کاری لەو شێوەیە قەبوڵدەکەن ئەمانەت و سەربەخۆیی پیشەکەیان لەدەست داوە.

لە هەندێ شوێندا،بەتایبەت لە شارە دوور و لادەستەکان،زۆرجار سەرنووسەر یان ئەندامانی دەستەی نووسین جگە لە کاری ڕۆژنامەوانی ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی یان پەروەردەی شارەکەیانن،ئایا ئەم حاڵەتانە تاچەند ڕێپێدراون؟هەندێك ئەمە بە دوو فاقی دادەنێن و بەپێویستی دەزانن ڕۆژنامەنووس ئیشێکی دیکە لەگەڵ پیشەی سەرەکی کۆنەکاتەوە،هەروەها جەخت لەوەش دەکەن کە بەهیچ شێوەیەك ناکرێ ڕۆژنامەنوس لەیەك کاتدا بەرپرسێکی سیاسی یان حیزبی بێ و کاری ڕۆژنامەوانیش ئەنجام بدات.

هەندێك لە بلاَوکەر و خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکان پێیان ئاساییە گەر لەگەڵ بەرپرسیارییەتیە ڕۆژنامەوانیکەیان پۆستێکی گشتیش بەڕێوە ببەن،بەو پێیەی کاری ئەوان لە

ڕۆژنامەکان پەیوەندی بە نووسین و کرۆکی کارەکەوە نییە،بەشێك لە پسپۆڕانی میدیاش تاڕادەیەك ئەوەیان قەبوڵە،بەلاّم زۆر بەگرنگییەوە جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەن کە هەرگیز ڕێپێدراو نییە سەرنووسەر و بەڕێوەبەری نووسین و ئەندامانی دەستەی نووسین هاوکات لەگەڵ کاری ڕۆژنامەوانیان ئیدارەی پۆستێکی گشتی یان حیزبیش بکەن،بەلاّم ڕۆژنامەنوسان ئەمەیان قەبوڵ نییە و پێیان وایە بەشداری ئەوان لە کاری ئیداری و سیاسی زۆر پێویست و گرنگە لەبەر دوو خاڵی سەرەکی ئەوانیش:

یەکەم:پشکداربوون لە کاری سیاسی و حیزبی، مەودا و تێڕوانینیان بۆ پرسە سیاسییەکان فراوانتر دەکا،و پسپۆری و تەجرەبەیەکی باشیان پێدەبەخشێ کە لەکاری ڕۆژنامەوانیدا زۆر سوودی لێوەردەگرن.

دووەم:ئەوان وەك هەر تاکێکی دیکەی کۆمەڵگە بەرپرسیارییەتی و خزمەتکردنی کۆمەڵگەیان لە ئەستۆیە،بۆیە وەرگرتنی هەر پۆستێکی ئیداری و گشتی وەك تەکلیف و بەرپرسیارییەتی بەرامبەر کۆمەڵگەکەیان تەماشا دەکەن.

بەلاّم ڕۆژنامەنووسی ناودار ی ئەمریکی(ڕۆزنتاڵ)ئەم پاسا و قسانە بە نامەشروع و بێبنەما دادەنێ و دەڵێت:"ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە ئەو ڕۆژنامەنووسەیە کە واز لە هەموو چالاکییەکی سیاسی دەهێنێت تەنها مافی دەنگدان نەبێت".

وەك دەبینین تێڕوانین و بیروبۆچوونی ڕۆژنامەنووسان دەربارەی ئەم بابەتە جیاوازە،هەندێك ڕۆژنامەنووسی دیکەش بە پێچەوانەی سەرجەم بیروڕاکانی پێشوو دەڵێن: شتێکی ناواقیعییە ڕێگە لە ڕۆژنامەنووس بگیرێت جگە لەکاری خۆی مومارەسەی کارێکی دیکە بکات،یان بەشداری لە چالاکییە مەدەنییەکان بکات،لەم بارەیەوە ڕۆژنامەنووس (یوچین باترسون)لە ڕۆژنامەی(سان بیتربرز تایمز)دەڵێت:"هەموومان کۆمەڵە بەرپرسیارییەتیەکی مەدەنیمان لە ئەستۆدایە،ئەگەر بە ئەرکی خۆمان هەڵنەستین ،ئەوا کۆمەڵگە مافی خۆیەتی بە هاولاّتی خراپ و بێ کەڵك ناومان ببات،بۆیە ڕیگەگرتنی ڕۆژنامەنووسان لە مومارەسەکردنی کار و چالاکی مەدەنی،دوورخستنەوەیانە لە ڕاپەڕاندنی ئەرك و بەرپرسیارییەتیان".

لە نێوان ئەم هەموو بیروبۆچوونە دژ بەیەکە،کۆمەڵە ڕۆژنامەنووسێك چارەسەرێکی مامناوەندی دەخەنەڕوو،چارەسەرەکەی ئەم ڕۆژنامەنووسانە بەچەند مەرجێکی دیاریکراو ڕێگە بە ڕۆژنامەنووسان دەدات پشکداری چالاکییە مەدەنی و سیاسییەکان بکەن،وەك لەو نموونانەی خوارە ڕووندەبێتەوە:

- بەرپرسی لاپەڕەی ئابووری یان وەرزشی رۆژنامەیەك دەتوانێ بەشداری یان ئەندامیەتی کۆمەڵەیەکی کۆمەلاَیەتی بکات بەمەرجێك ئەو پشکدارییەی کار لە لایەنی پیشەیی کارەکەی نەکات،بەلاَم ئەو پەیامنێرەی هەواڵەکانی کۆمەڵەکە رووماڵ دەکات،بۆی نییە ببێتە ئەندامی کۆمەڵەکە.
- دەکرێ رۆژنامەنووس بەشداری کار و چالاکییە کۆمەلاَیەتی و سیاسی و ئابوورییەکان بکات بەو مەرجەی رۆژنامەکەی بەئاشکرا خوێنەران لە جۆر و ماهیەتی بەشداری رۆژنامەنووسانی لەو چالاکییانە ئاگاداربکاتەوە،وەك ئەوەی رۆژنامەی(لیوستیون تریبۆن)کردی،کاتێك لیستێکی بە ناوی ئەو رۆژنامەنووسانەی بلاَوکردەوە کە بەشداری لە چالاکییە مەدەنییەکان دەکەن،لەگەلّ بلاَوکردنەوەی ناوی نێوەندە سیاسی و کۆمەلاَیەتییەکان.

لە کۆتاییدا زۆر گرنگە بەر لەوەی رۆژنامەنووس قەبولّی هەر پێشنیارێکی ئەندامبوون لە هەر نێوەند و کۆڕبەندێکی سیاسی و ئابووری و کۆمەلاَیەتی بکات،لەخۆی بپرسێت بۆچی جگە لەهەر کەسێکی دیکە داوای ئەندامییەتی لەو دەکرێت!!؟لە هەموو حاڵەتەکاندا لە پێناو پارێزگاریکردن لە سەربەخۆیی خۆی،پێویستە رێگە بە هیچ کەس و لایەنێك نەدات ئیستعلالی بکەن و بۆ مەبەست و ئامانجی تایبەتی خۆیان،لەسەر حیسابی پیشەکەی بەکاریبێنن.

## بەشی دووەم:

## بنەماکانی راستگۆیی و وردبینی، بابەتیبوون، بێلایەنی،پاراستنی نهێنی، دەستپاکی.

### یەکەم:بنەمای راستگۆیی و وردبینی

بەدەستهێنانی باوەڕ و متمانەی خوێنەر،بنەمای رۆژنامەگەری باش و سەرکەوتووە،پێویستە هەموو شتێك بکرێت لە پێناو وەرگرتنی متمانەی خوێنەر،دەبێ چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان بەشێوەیەك دابڕێژرێن گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتەکان بکەن،دەبێ بێلایەن و وردبینانە زانیارییەکان بخرێنە روو،وتارەکانی بیرو را و بابەتە شیکارییەکانیش وردبین و واقیعیانە بن ،هەڵە و کەموکورییەکانیش دەبێ بەخێرایی و بێ دوودڵی راستبکرێنەوە.

هەڵەکردن شتێکی باوە لە کاری رۆژنامەگەریدا،هۆکاری سەرەکی بۆ ریتمی خێرای کاری رۆژنامەوانی دەگەڕێتەوە،سەرباری هەوڵە چڕ و پڕ و بەرداوامەکانی ستافی نووسین و زمانوانانی رۆژنامە و گۆڤار و تەلەڤزیۆنەکان،کەچی هەڵەکان بەردەوامن و بنەبڕنابن،زۆرجار ئەو هەڵانە کاریگەری جەوهەریان دەبێ لەسەر ناوەڕۆکی بابەتەکان یان ناو و پێگەی ئەوانەی زانیاری و هەواڵەکەیان لێوەرگیراوە.

هەڵەکردن بەرامبەر ئەوانەی لێدوان و زانیارییان لێوەردەگیرێت،یان بەهەڵە ناویان لە دەزگاکانی راگەیاندن دەخوێندرێتەوە و دەنووسرێت،باوەڕ و متمانەیان بەو دەزگایانە کەمدەبێتەوە،لە هەندێ حاڵەتیشدا دەزگاکە رووبەڕووی دادگا و لێپێچینەوە دەکات،هەڵە رۆژنامەوانییە بەردەوامەکان زۆرخراپ بەسەر دەزگاکان دەشکێنەوە، و دەزگاکان،بە هۆیانەوە باجێکی زۆر دەدەن.

پێوەری راستگۆیی و وردبینی پێوەرێکی بنەڕەتی ئیتیکی کاری رۆژنامەوانییە،(جۆزێف پۆلیتزەر)لەبارەیەوە دەڵێت:"هەموو زانیارییەك پێش بەکارهێنانی لێیبکۆڵەوە".هەروەها

لەوتەیەکی دیکەدا دەڵێت:"رۆڵی رۆژنامەوانی تۆڵەکردنەوە و بڕیاردانی پێشوەخت و لایەنگیریکردن نییە،بەڵکە خستنەڕووی نموونەیەکی باڵایە لە راستگۆیی و لێکدانەوەی ورد بۆ ئەو کێشانەی کۆمەڵگە رووبەڕوویان دەبێتەوە،هەروەها هەستکردنی رۆژنامەنووسیشە بە بەرپرسیارییەتی ئیتیك،کە رۆژنامەوان لە ملدان بۆ بەرژەوەندی تایبەت و ئامانجی خۆپەرستانە لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی دەپارێزێت".

وردبینیکردنی رۆژنامەنووس لە ناو و کات و شوێن و جۆری هەواڵ و ئەوانەی سەرچاوەی هەواڵن،لەگەڵ ئەوەی کاتێکی زۆری لێدەبات، بەڵام کارێکی زەرووره،پێویستە رۆژنامەنووس هەمووکات ئەو وتەیەی لەبەرچاو بێ کە دەڵێت:بەردەوام بەدوای هەواڵدا رابکە و هەوڵی کۆکردنەوەی بدە،بەڵام بەر لە بڵاوکردنەوەی لە راستی و دروستی دڵنیابە .

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان هەڵەکردن و وردبینی نەکردن،لەوانەیە هەڵەکردن بە ئەنقەست نەبێ،بەڵام وردبینینەکردن بە کەتەرخەمی دادەندرێ و بە خراپ بەسەر رۆژنامە و دەزگاکەی دەشکێتەوە،شکل و شێوەکانی ناڕاستگۆیی وردبینینەکردن زۆرن،هەندێکیان وەك نموونە دەهێنینەوە:

- رۆژنامەنووسێکی ناودار لە یەك لە رۆژنامەکان بابەتێکی دەربارەی شەڕی نێوان دو چەکدرا لە شارێکی ئەمریکا بڵاوکردەوە،چەند رۆژنامەیەکی دیکەش هەر لە زاری ئەو رۆژنامەنووسە بابەتەکەیان دووبارە کردبۆوە،بەڵام دواتر دەرکەوت رووداوەکانی بابەتەکە سەرلەبەر هەڵبەستراو و درۆیە.راستگۆیی رۆژنامەنووس سەنگی مەحەکی کارەکەیەتی،بەڵام هەندێکیان لە پێناو سەرنجراکێشان و پڕخوێنەری بابەتەکەیان، پەنا بۆ موبالەغە و هەواڵ هەڵبەستن دەبن.
- رۆژنامەنووسێکی تریش بابەتێکی لەژێر ناونیشانی(پارێزگار دەدوێت)بڵاوکردبۆوە،ناوەڕۆکی بابەتەکە بەشێوازێکی گاڵتەئامێز داڕێژرابوو،باسی لە کەموکورتییەکانی پارێزگار دەکرد،بێئەوەی تەنها وتەیەکی پارێزگاری تێدابێ،بەڵام ناونیشانەکەی گوزارشتی لەوە دەکرد کە بابەتەکە لە نووسینی پارێزگارە،ئەم ناونیشانە پارێزگاری تووڕەکرد،ناچار رۆژنامەکە پۆزشی هێنایەو داوای لێبوردنی لە پارێزگاری شارەکە کرد.
- پەیامنێری رۆژنامەیەك وێنەی جووتیارێکی ئەمریکی بۆ ئاژانسێکی هەواڵی نارد لە گەڵ وێنەی ئەو پارچە شینابییەی کە وەك ئالای ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چێندرابوو،ئاژانسەکەش ئەم وێنەی بەسەر دەزگاکانی راگەیاندن بڵاوکردەوە،بەڵام پاش ماوەیەك

دەرکەوت بابەتەکە سەرلەبەر دروستکراوە،دەرئەنجام رۆژنامەکە ئەو پەیامنێرەی لە ستافەکەی دوورخستەوە.

## راستکردنەوەی هەڵە رۆژنامەوانییەکان

سەرجەم دەزگا رۆژنامەوانییەکان تووشی هەڵەی رۆژنامەوانی دەبن،هەڵەنەکردن لەکاری رۆژنامەوانیدا شتێکی مەحاڵە، جا ئەم هەلاّنە بەهۆی چاپکردنەوە بێ یان بە ئەنقەست،باشترین و ناودارترین دەزگا رۆژنامەانییەکان بەدەر نین لە هەڵە و کەموکورتی،ئەوەتا رۆژنامەیەکی ناودار و موعتەبەری وەك(وۆڵ سترست جۆرناڵ)لە مانگێکدا ٣٠-٥٠ راستکردنەوەی هەڵە بلاّودەکاتەوە!!وەك گوتمان هەڵەکردن شتێکی حەتمییە، بەلاّم گرنگ راستکردنەوەی هەڵەکانە،ئەم راستکردنەوەیەش مەرج و رێ و شوێن و ئەتەکێتی تایبەتی هەیە،وەك،پێویستە دەزگاکە بەخێرایی و بێ دواکەوتن هەڵەکە راستبکاتەوە،راستکردنەوەکە لە لاپەڕە و شوێنێکی دیاری رۆژنامەکە بێ،روون و رەوان و مانابەخش بێت،مانشێتێکی سەرنج راکێش و دیاری هەبێ.

دەزگا رۆژنامەوانییەکان فێڵ و تەکنیکی جۆراوجۆری راستکردنەوەی هەڵەیان هەیە،هەندێکیان هەرگیز راستەخۆ دان بەهەڵەکانیان دانانێن،بۆیە لەحاڵەتی راستکردنەوەشدا ناڕاستەخۆ هەڵەکان راستدەکەنەوە، وەك ئەوەی رۆژنامەی یەك لە زانکۆکان لەکاتی بلاّوکردنەوەی دیمانەیەکی سەرۆکی زانکۆکە بە مانشێتێکی گەورە نووسیبووی"سەرۆکی زانکۆ یارمەتییە داراییەکانی قوتابیان کەمدەکاتەوە!!"،پاش بلاّوبوونەوەی ئەو دیمانەیە سەرۆکی زانکۆ نارەزایی دەربڕی و نامەیەکی ئاڕاستەی رۆژنامەکە کرد،رۆژنامەکەش لە ژمارەی داهاتووی و لە پەراوێزی هەمان لاپەڕە بە فۆنتێکی بچووك،لەشێوەی هەواڵ نەك پۆزش و راستکردنەوە،هەواڵەکەی بلاّوکردەوە بەلاّم بێئەوەی دان بەهەڵەکەی بنێت.

لە هەڵەیەکی دیکەی هاوشێوەدا،گۆڤارێك لە میانی ئەنجامدانی دیمانەیەك لەگەڵ گەنجێك کە بە دوو ساڵ لەبری چوار ساڵ قۆناغی زانکۆی بڕیبوو،لەسەر زاری گەنجەکەوە نووسیبووی:"ئەمە کارێکی ئاسانە گەر مرۆڤ خاوەن عەقلێکی زێڕین بێ"،ئەم گوتەیە شەپۆلێکی نارەزایی گەورەی بەدوای خۆیدا هێنا،گەنجەکەش لای خۆیەوە سەرزەنشتی رۆژنامەکەی کرد،و داوای راستکردنەوەی قسەکانی لێکردن،لە ژمارەی داهاتوودا، رۆژنامەکە بە فۆنتێکی بچووك، و لە ژێر مانشێتێکی بچووکدا، و لە شوێنێکی لاوەکیدا

نووسیبووی"گەنجەکە مەبەستی بووە بڵێت ئەمە کارێکی ئاسانە گەر مرۆڤ خاوەن ئامانجێکی دیاریکرا و بێت".

لە هەردوو حاڵەتی پێشوودا،رۆژنامەکان لەرووی تەکنیکییەوە هەڵەکانیان تاڕادەیەك راستکردبووەوە،بەلاّم راستکردنەوەیەکی راستەخۆ و ئەوتۆ نەبوو زەرەر و زیانی مەعنەوی سەر ئەوانەی ئینتەرڤیویان لەگەڵ کرابوو هەڵبگرێ و ئیعتیبباریان بۆ بگەڕێنێتەوە.

وەك ئاماژەمان پێدا راستکردنەوەی هەڵە رۆژنامەوانییەکان مەرج و رێکار و ئەتەکێتی تایبەتی هەیە،هەنووکە ٤/٣ رۆژنامەکان کۆمەڵە رێوشوێن و رێکارێك پەیڕەودەکەن،وەك تەرخانکردنی شوێنێکی گونجاو و دیاریکراو و ،لە لاپەڕەی یەکەم یان دووەمی رۆژنامەکان لەژێر ناونیشانی (راستکردنەوە)،هەروەها دەبێ ناوەڕۆکی راستکردنەوەکە روون و ئاشکرا بێ،بە زمانێکی رەوان نووسرابێ،بەهەمان فۆنت و قەبارەی نووسینە هەڵەکە.

زۆربەی رۆژنامەنووسان بەزەحمەت دان بەهەڵەکانیان دادەنێن،هەردەم پاساوی ئەوە بۆ هەڵەکانیان دێننەوە کە بچووك و جەوهەری نین،بەلاّم بەلای بەشی دووەمی هاوکێشەکەوە،واتە خوێنەران و ئەوانەی هەڵەیان بەرامبەر کراوە،گەورە و جێی بایەخن،بۆیە ئیعتیرافکردنی رۆژنامەنووس بەهەڵەکانی و راستکردنەوەیان،سەنگی مەحەکن لە هەڵسەنگاندنی متمانەو باوەڕی خوێنەر بە رۆژنامەنووس و دەزگاکانی راگەیاندن.

متمانە و باوەڕی جەماوەر بە رۆژنامەنووس تەنها وابەستەی راستکردنەوەی هەڵەکان و پۆزش هێنانەوە نییە،بەڵکە بێلایەنی لە خستنەرووی رووداو و زانیارییەکان فاکتەرێکی دیکەی بەهێزکردنی پێگەی پیشەیی رۆژنامەنووسە لە کۆمەڵگە.

گەر دەسنیشانکردنی هەڵە رۆژنامەوانییەکان کارێکی ئاسان بێ،ئەوا دەسنیشانکردنی رادەی بێلایەنی رۆژنامەنووسان لە خستنەڕووی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان کارێکی زەحمەتە، بەهۆی ناڕووی و تێکهەڵکێشی ئەو بابەتە بە کۆمەڵە بابەتێکی دیکە.لەراستیدا بێلایەنی رۆژنامەنووس گرێدراوی تێڕوانینی خوێنەر و رۆژنامەنووس و ئەو کەس و لایەنانەیە کە هەواڵ و زانیارییان لەبارەیەوە بلاّودەکرێتەوە،بۆ نموونە ئەو رۆژنامەنووسەی لە نووسینی بابەتێکی رۆژنامەوانیدا پێی وایە لایەنە گرنگەکانی بابەتەکەی ئیبرازکردووە،لەوانەیە لە دیدی خوێنەرەوە مەسەلەکە پێچەوانە بێ.

لە هەندێك حاڵەتدا رۆژنامەنووس بەئەنقەست لاگیری خۆی لە خستنەڕووی بابەتەکان دەسەپێنێ، بۆ خزمەتکردنی پرس یان لایەنێکی دیاریکراو،بەلاّم بێئەوەی رێگەبدات خوێنەر

هەست بە مەسەلەکە بکات،بۆنموونە وێنەگرێك لەکاتی رووماڵکردنی گردبوونەوەیەکی جەماوەری لەمیانی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی (هنری جاکسۆن)بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا،وێنەیکی ئەو گردبوونەوەیەی گرتبوو کە تەنها سێ کەس لەوێنەکە دەرکەتبوون و دیمەنەکە بەشێوەیەك بوو گوزارشتی لەوەدەکرد تەنها ئەو سێ کەسە ئامادەی گردبوونەوەکە بوونە،سەرنووسەریش بە ئەنقەست ئەو وێنەیەی بە گەورەیی دابەزاندبوو،وێنەگرتنی دیمەنەکە بەو شێوەیە و دواتر بلاوکردنەوەی بەبڕیاری سەرنووسەر، گوزارشتە لە تەرەفگیری ئەو رۆژنامەیە بۆ رکابەرانی(جاکسۆن)لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

بەکورتی، وردبینی رۆژنامەنووس لە کارەکەی و ،خێرا راستکردنەوەی هەڵەکان،و بێلایەنی لە خستنەڕووی زانیاری و رووداوەکان،دەلالەت لە راستگۆیی رۆژنامەنووس دەکەن،هاوکات زامنی متمانە و باوەڕی جەماوەرن بە پەیامی رۆژنامەگەری.

## دووەم:بنەمای بابەتیبوون

بابەتیبوون یان مەوزوعیەت واتە زاڵنەبوونی لایەنی کەسی-زاتی بەسەر ناوەڕۆکی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان، و رەنگنەدانەوەی بیر و بۆچوون و خواستی خودی بەسەر رۆژنامەنووسەوە،یان مامەڵەکردنی بێلایەنانە لەگەڵ زانیاری و رووداوەکان،پەیڕەوکردنی پرسی بابەتیبوون پرسێکی نزیکە لە بنەمای بێلایەنی،مەوزوعیەت فاکتەرێکی گرنگی وەدەستهێنانی متانەی خوێنەرە،هیچ بەرهەمێکی رۆژنامەوانی بەبێ دەستپاکی و بابەتیبوون ناتوانێ متمانەی وەرگرەکانی زامن بکات،چونکە بە زەقترین ئەو بنەما ئیتیکییانە دادەندرێت کە رۆژنامەنووسێکی بەرپرسیار لە رۆژنامەنووسێکی رووزەرد و نامولتەزیم جیادەکاتەوە،پێویستە راستگۆیی ئامانجی سەرەکی رۆژنامەنووس بێ،رۆژنامەنووسی بابەتی ئەو رۆژنامەنووسەیە کە وردەکارە لە داڕشتن و کۆکردنەوەی هەواڵەکان،مانشێتی بابەتەکانی گوزارشتی راستەقینە لە ناوەڕۆکی بابەتەکانی دەکات، و روداوێکی سادە و ئاسایی گەورە ناکات،هەروەها خۆی لە هەموو هەوادارییەك بۆ روداو و هەواڵەکان دەپارێزێت.

## سێهەم:بنەمای بێلایەنی

مەبەست لە بێلایەنی دەمکوتکردنی رۆژنامەنووس و رادەرنەبڕین نییە،بەڵکە جیاکاریکردنە لە نێوان هەواڵ و راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان لەلایەك و ،وتارەکان لەلایەکی دیکە،کە لە یەکەمیان هیچ بوارێك بۆ رادەربڕین و تەرەفگیری نییە،بەلاّم لە دووەمیاندا

پانتاییەکی فراوان بۆ بەرجەستەکردنی بیروڕاکان بەدیدەکرێت،چونکە لەبنەڕەتدا وتاری ڕۆژنامەوانی وتاری بیروبۆچوون و رەخنەگرتنە.

لەپەنجاکانی سەدەی رابردوو گەنگەشە و گفتوگۆی فراوان دەربارەی جیاکاریکردن لە نێوان هەواڵ و بیر و بۆچوونی کەسی بەڕێوەچوو،دوای ئەوەی سالأنێکی زۆر قەدەغەبوو ڕۆژنامەنووس باس لە بلاۆکردنەوەی بیروبۆچوونی کەسی لە دەزگاکانی راگەیاندن بکات،لە کۆندا پێوەری بابەتیبوون زۆر بەتووندی لەکاری ڕۆژنامەوانیدا پەیڕەو دەکرا،جار جار لە وتارە ڕۆژنامەوانییەکاندا بۆنی رادەربڕین دەکرا،دەنا بەگشتی زۆربەی وتارەکان بریتیبوون لە تەفسیر و روونکردنەوەی هەواڵ و رووداوەکان،بەلاّم ئەو گفتوگۆیانە دەرگەی لەبەردەم پرسی رادەربڕین لە ڕۆژنامەگەری کردەوە،دوای چەند سالێك لە گفتوگۆ و راگۆڕینەوە، پسپۆرانی میدیا و ڕۆژنامەنووسان گەیشتنە ئەو بڕوایەی مەسەلەی بیروبۆچوون و رادەربڕین لە ڕۆژنامەگەریدا بەهۆی گۆڕانکارییەکان و خێرابوونی ریتمی ژیان،شتێکی زەرووره،بۆیە رێگە بە ڕۆژنامەنووسان درا تەعبیر لە بیروبۆچوونە تایبەتییەکانیان بکەن بەمەرجێك بیروبۆچوونەکانیان لە داڕشتنی هەواڵ و راپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکانیان رەنگ نەداتەوە،بەڵکە تەنها ژانرێك کە بورای رادەربڕینی تێدایە وتارە،ئەم رێپێدانە کاریگەری پۆزەتیڤی لەسەر هونەری وتارنووسین هەبوو،بەهۆیەوە وتار لە رووی فۆرم و ناوەڕۆك و زمان و تەکنیکەوە پێشڤەچوونی بەرچاوی بەخۆوە بینی،هاوکات ڕۆژنامەوانی خزمەتێکی ئیزافی پێشکەش بە خوێنەرانی کرد کە بریتییە لە پێراگەیاندن و رۆشنبیرکردن و پێدانی زانیاری قوڵتر دەربارەی هەواڵ و زانیارییەکان لەرێگەی وتارەوە.

کەواتە جیاکاریکردن لەنێوان ژانرە جیاجیاکانی ڕۆژنامەوانی لە(هەواڵ و راپۆرت و دیمانە و وتار)و دەسنیشانکردنی بابەتە هەواڵییەکان و بۆچوونە تایبەتییەکان،لایەنێکی گرنگی دەرخستنی بێلایەنی هەواڵ و ڕۆژنامەنووسانە.

هەر سەبارەت بە پرسی بێلایەنی،سۆسیۆلۆژیزانی ناودار(مۆریس جانۆتیز) لە زانکۆی شیکاگۆی ئەمریکی،دوای ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی، ڕۆژنامەنووسان بەسەر دوو بەش دابەش دەکات،یەکەمیان بە پارێزەرانی هەواڵ ناودەبات،دووەمیشیان بە راوێژکارانی هەواڵ.

جۆری یەکەمی ڕۆژنامەنووسان خۆیان بە بەرپرسی یەکەمی پارێزگاریکردن لەهەواڵ دەزانن،ئەوان تا تەواو دڵنیانەبن لە راستی هەواڵ و زانیارییەکان و راستگۆیی سەرچاوەکانی،بلاۆویناکەنەوە،تا بلاۆکردنەوەشی چاودێری سەرجەم قۆناخەکانی ئامادەکردنی

دەکەن،بۆیە ئەوان زۆر بەوردی بە مەسەلەی بێلایەنی و بابەتیبوونەوە خەریکن،بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان پێ میسالی نییە و ئیدیعای ئەوە ناکەن هەرگیز سەرپێچی و هەڵەیان نییە.

بەلاّم گروپی راوێژکارانی هەواڵ پێیان وایە ئەوان بەرپرسیارییەتیەکی ئەخلاّقیان بەرامبەر جەماوەر لە ئەستۆدایە،ئەوان پارێزەری جەماوەرن لەبەردەم دەسەلاّت،بۆیە ئەرکی ئەوانە لە رێگەی را و بیروبۆچوونەکانیانەوە زانیاری و شیکردنەوەی قووڵ دەربارەی پرسە پەیوەندیدارەکان بە ژیانی رۆژانەیانەوە ببەخشن،هاوکات ببنە هۆکاری بەرچاوڕوونی و رۆشنفکرکردنیان.

پارێزەرانی هەواڵ بەتووندی جەخت لەسەر پێڕاگەیاندنی زانیاری و هەواڵ دەکەن بە ئەمانەتەوە و بێ دەستکاریکردن،لایەنگیرانی ئەو گروپە زیاتر پەیامنێر و نێردراوە رۆژنامەوانییەکانن.

بەلاّم راوێژکارانی هەواڵ بەپێویستی دەزانن کە رۆژنامەنووس تا رادەیەکی دیاریکراو جێپەنجەی لە هەواڵ و رووداوەکان دیاربێ،بەلاّم بێئەوەی دەستکاری هێڵە گشتی و بنەڕەتییەکانی هەواڵ بکات،ئەندامانی ئەو گروپەش بە پلەی سەرەکی وتار نووسەکانن.

بەلاّم هەنووکە بەشێك لە کارمەندانی ئامادەکردنی هەواڵ،واتە پەیامنێر و نێردراوان،لە بیروبۆچوونی گروپی دووەم نزیك بوونەتەوە،ئەوانیش داوادەکەن بەشێك لە بیروبۆچوونەکانیان بخزێندرێتە دووتوێی هەواڵ و رووداوەکانەوە!ئایا ئیقرارکردنی کارێکی وەها چ ئاسەوارێکی لەسەر دەزگا رۆژنامەوانییەکان و خوێنەران دەبێ؟؟

لەراستیدا رێگەدان بەدزەکردنی راوبۆچوونی رۆژنامەنووس بۆ نێو هەواڵ و راپۆرتەکان،کارێکی مەترسیدارە،بەدرێژایی سەدەی بیستەم ئەوەی هەیبەت و هێزی بە رۆژنامەگەری بەخشیبوو،رومالّکردنی هەواڵ و رووداوەکان بوو بێلایەنانە و بە ئەمانەتەوە،مسداقیەتی رۆژنامەگەری لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە هێلێکی جیاکەرەوەی لە نێوان بلاّوکردنەوەی هەواڵ و راوبۆچوونە شەخسییەکان داڕشتبوو،رێکلاّم و بابەتەکانی پیرۆزبایی لەژێر مانشێتی تایبەتی و لە لاپەڕەی تایبەت بلاّودەکرێنەوە،بەلاّم بلاّوکردنەوەی هەواڵ بە دەستکاری و نابێلایەنانە،مانای وازهێنانی رۆژنامەگەرییە لە ئەرکێکی سەرەکی سەرشانی،کە دەرئەنجام بە خراپی بەسەر متمانەی خوێنەر بە دەزگا رۆژنامەوانییەکان دەشکێتەوە.

تێکەڵکردنی بیروڕای کەسی بە هەواڵ و رووداوەکان، واتای گەیاندنی نیوەی راستییەکانە بەخوێنەر ،لەم حالّەتەدا جەماوەر مافی خۆیەتی چیتر رۆژنامەگەری وەك بریکاری بەرژەوەندییەکانی بەرامبەر دەسەلاّت قەبووڵ نەکات.

بنەما ئاکارییەکانی کاری راگەیاندن بەئاشکرا داوا لە کادیرانی ئەو بوارە دەکات بێلایەنانە،دوور لە تێکەڵکردنی راو بۆچوونی شەخسی هەواڵ و راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان بگەیەننە خوێنەرانیان،و جیاکاری لە نێوان رادەربڕین و هەواڵ نووسیندا بکەن،هەر بۆیە داوا دەکات خۆیان لەو مومارەسانە بە دوور بگرن کە دەبنە مایەی کاڵکردنەوەی هێڵی جیاکردنەوەی هەواڵ لە وتارەکانی رادەربڕیندا،لەوانەش:

- هەندێك لە رۆژنامەنووسان لەکاتی نووسینی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان پەنا بۆ ئیسلوبی دیالۆگ دەبەن،دەیانەوێت لەرێگەی ئەو شێوازەوە کە شێوەی گفتوگۆکردن لە نێوان دوو کەس وەردەگرێت،هەواڵەکە بگەیەننە خوێنەر،لەکاتێکدا لە ئەسڵی رووداوەکە بە هیچ شێوەیەك گفتوگۆکردن روونەداوە .
- هەندێك هەواڵ سەرچاوەیەکی دیاری زانیاریان نییە،رۆژنامەنووسەکە دەنووسێت(سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو پێی راگەیاندین...)یان(سەرچاوەیەك کە نەیویست ناوی ئاشکرا بکەین...)یان(سەرچاوەیەکی نزیك لە...)یان(بەبڕوای پسپۆڕانی ئەو بوارە..)،ئەو شێوە هەوالآنە لەگەڵ ئەوەی جێگەی گومانن،کەچی بەردەوام لە دەزگاکانی راگەیاندن دووبارە دەبنەوە،بەلاّم مسداقییەتیان لای خوێنەر وەك مسداقییەتی هەواڵە سەرچاوە دیارەکان نییە،هاوکات نابێ بەچاوی گومانەوە لە هەموو هەواڵێکی سەرچاوە نادیار بڕوانین،چونکە لەهەندی حاڵەتدا بەهۆی یەکلانەبوونەوەی سەد دەرسەدی زانیارییەکان،یان بەهۆی هەستیاری بابەتەکە،لەوانەیە لەسەر داوای سەرچاوەی هەواڵەکە،رۆژنامەنووسەکە ناوی سەرچاوەکە ئاشکرا نەکات.

بەگشتی دەکرێ بڵێین،هەواڵە سەرچاوە نادیارەکان ناتوانن متمانەی خوێنەر بۆخۆیان زامن بکەن،چونکە چەندین پرسیاری گوماناوی لە مێشکی خوێنەر دەوروژێنن و بێ وەلاّم دەمێننەوە ، دەرئەنجامیش بە سلبی بەسەر دەزگاکەدا دەشکێتەوە.

بەپشتبەستن بەو زانیارییانەی دەربارەی بنەمای بێلایەنی خستمانەڕوو،دەکرێ هێڵە گشتییەکانی ئەو پرەنسیپە لە سێ خاڵی سەرەکی کۆبکەینەوە:

١/جیاکاریکردن لە نێوان هەواڵ و وتارەکانی بیرورا دەربڕین.

٢/خۆبەدوورگرتن لە هەواڵی سەرچاوە نادیار.

٣/ مامەڵەکردنی بێلایەنانە لەگەڵ سەرجەم هەواڵ و رووداوەکان،جا هی هەر کەس و لایەنێك بن،هەتا گەر هاتوو هەواڵەکە هی کەسێکی نەیار بە رۆژنامەنووس یان دەزگا رۆژنامەوانییەکە بێ.

## چوارەم:بنەمای پاراستنی نهێنی

دامودەزگا فەرمییەکان،یان حکومەت،سەرچاوەی سەرەکی زانیاریی دەزگاکانی راگەیاندنن،رۆژنامەنووس ئازادە لە بلاّوکردنەوەی ئەو داتا و زانیارییە فەرمییانەی خزمەت بە بەرژەوەندی گشتی دەگەیەنن،بەلاّم لە هەمان کاتدا پێویستە وریابن لە بلاّوکردنەوەی ئەو دیکۆمێنت و ئامار و هەوالاّنەی پەیوەندییان بە نهێنی تایبەتی دەولّەت و ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە،لە زۆربەی ولاّتاندا هەندێ زانیاری دارایی و سەربازی و دادوەری و هەوالّگری و سەرۆکایەتی هەیە زۆر بەدەگمەن رێگە دەدرێت دەستی رۆژنامەنووسانی بگاتێ،کاربەدەستانی دەولّەت پێیان وایە بلاّوکردنەوەی ئەو زانیارییانە هیچ سوودێکیان بۆ جەماوەر نییە تەنها زیانگەیاندن بە ئەمنییەت و بەرژەوەندی گشتییەوە نەبێ،بۆیە داوا لە رۆژنامەنووسان دەکەن پابەندی بلاّونەکردنەوەی ئەو جۆرە زانیاری و دیکۆمێنتانە بن.

بەلاّم هەندی نیزامی سیاسی،بەتایبەت سیستەمە شمولییەکان ئەو پرسە دەقۆزنەوە و بە بیانووی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی،پانتایی ئازادییەکان تەسك دەکەنەوە و بلاّوکردنەوەی زۆربەی زانیارییەکان دەخەنە چوارچێوەی زیانگەیاندن بە ئاسایشی نەتەوەییەوە،بۆیە دەبێ رۆژنامەنووس و سەندیکا و رێکخراوە رۆژنامەوانییەکان لەو فێلّ و تەکتیکانەی دەولّەت بەئاگابن و داکۆکی لە ئازادی و وەدەستهێنانی زانیاری بکەن،چونکە بێ هەبوونی ئازادی و مافی وەدەستهێنانی زانیاری،رۆژنامەوانی دەسەلاّتێکی شەکلی بێ ماهیەت و کاریگەرە.

## پێنجەم:بنەمای دەستپاکی

دەستپاکی لە کاری رۆژنامەوانیدا، واتە مامەلّەکردنی راستگۆیانە لەگەلّ سەرجەم ئەو کەس و سەرچاوە و زانیارییانەی پەیوەندییان بە بەرهەمهێنانی ژانرە رۆژنامەوانییەکانەوە هەیە،پێویستە لەسەر میدیاکاران مافی ئەو کەس و لایەنانە بپارێزن کە پەیوەندییان بە هەوالّەوە هەیە،و رەچاوی بنەما ئاکارییەکانی ئەو بوارە بکەن،هەروەها دەبێ بواری بەرگریکردن بۆ ئەو کەسانەش برەخسێنن کە وەك تۆمەتبار لە چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان ناویان دێت.

پاراستنی ناوی نهێنی سەرچاوەکانی هەوالاّیش بنەمایەکی دیکەی ئاکارییە،دەبێ رۆژنامەنوسان بەوەفابن بەرامبەر بەسەرچاوەکانی هەوالّ و ناویان بپارێزن گەر هاتوو لەسەر داوای خۆیان حەزیان نەکرد ناویان ئاشکرا بکرێت،بەلاّم بە پێچەوانەوە رۆژنامەنووس مولزەمە سەرچاوەی زانیارییەکانی بلاّوبکاتەوە دەنا مسداقییەت و متمانەی دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

هەندێك هەواڵ بەر لە بڵاوكردنەوەی پێویستی بە وردبینی و لێكدانەوە هەیە،بەتایبەت ئەوانەی هەستیار و فرە ڕەهەندن،لەوجۆرە هەواڵانەدا دەبێ ڕۆژنامەنووس پێش بڵاوكردنەوەی لەخۆی بپرسێت ئایا چ كاریگەرییەكی نێگەتیڤی لەسەر ئەو كەسانە دەبێ كە پەیوەندییان بە هەواڵەكەوە هەیە؟ئایا بڵاوكردنەوەی چ سوودێك بە جەماوەر و ڕای گشتی دەگەیەنێت؟گەر بڵاوكردنەوەی هەواڵەكە بەخزمەتی ڕای گشتی شكایەوە، و زەرەری بۆ چەند كەسێكی پەیوەندار بە هەواڵەكەوە هەبوو،لەو حاڵەتەدا دەبێ بەرژەوەندی گشتی بخرێتە پێش بەرژەوەندی كەسییەوە.

لەم شێوە هەواڵانەدا بەرپرسیارییەتیەكی قورستر دەكەوێتە ئەستۆی ڕۆژنامەنووس،ڕۆژنامەنووسی خاوەن ئەزموون دەزانێ چۆن مامەڵە دەكات،پێویستە هەردەم ئەوەی لەبەرچاو بێ كە بڵاوكردنەوەی ڕووداوەكان وەك خۆی و بە گشت وردەكارییەكانییەوە،كارێكی زەروور و گرنگە،بەتایبەت گەر هاتوو بڵاوكردنەوەی سوودی بۆ ڕای گشتی زیاتر بوو لەو زیانەی بە كەسی پەیوەندار بە هەواڵەكە دەكەوێت. بۆ نموونە لە شارێكی بچووكی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ڕووداوی كوشتنی كچێك تۆماركرا،ڕۆژنامەی شارەكە بەكورتی و بێ باسكردنی وردەكارییەكان،ڕاپۆرتە هەواڵێكی بڵاوكردەوە،دواتر ڕۆژنامەیەكی ناودار لە واشنتۆن ڕاپۆرتێكی دوور و درێژی دەربارەی ئەم تاوان دابەزاند،لە ڕاپۆرتەكەدا ئاماژە بەوەدرابوو كچە كوژراوەكە ئافرەتێكی لەشفرۆش بووەو لەكاتی ڕۆیشتنی لەگەڵ پیاوێكدا كوژراوە،بڵاوكردنەوەی ئەو زانیارییانە نارەزاییەكی زۆری لە شارەكەدا بەدوای خۆیدا هێنا،بەڵام ژمارەیەكی زۆر لە ڕۆژنامەنووسان دەستخۆشییان لە سەرنووسەری ڕۆژنامەكە كردوو و بڕیارەكەیان بە بوێر وەسفكرد، و بڵاوكردنەوەی ئەو وردەكارییەیان بە بەشێكی سەرەكی لە چیرۆكە هەواڵییەكە هەژماركرد.

خاڵێكی دیكەی گرنگ كە زۆر جار ڕۆژنامەنووسان تووشی ئیحراجی دەكات بەرامبەر خوێنەر،بڵاونەكردنەوەی هۆكاری مردنی ئەو كەسانەیە كە خزم و كەسیان داوا لە ڕۆژنامەكان دەكەن هۆكار یان نەخۆشی ئەوانە بڵاونەكەنەوە كە گیانیان لەدەستداوە،ڕۆژنامەكانیش بۆ ڕێزگرتن لە هەست و شعوری خزم و ناسیاوانی مردووەكە نهێنی مردنەكە بە جەماوەر نادەن،بەڵام زۆربەی ئەو ڕاپرسییانەی دەربارەی ئەو بابەتە ئەنجامدراون دەریدەخەن كە ٩٥٪ خوێنەران حەز لە زانینی هۆكارەكانی مردن دەكەن،بنەما ئاكارییەكانی كاری ڕۆژنامەوانی تەنها لەدوو حاڵەتدا ڕێگە بە دەزگاكانی ڕاگەیاندن دەدەن بێ ڕەزامەندی كەسوكاری مردووەكە هۆكاری مردنەكە ئاشكرا بكەن، ئەویش گەر هاتوو بەهۆی ڤایرۆسێكی كوشندەوە بوو و

مەترسی بلاوبوونەوەی لێدەکرا و کاریگەری نێگەتیڤی بەسەر بەرژەوەندی گشتییەوە هەبوو،یان ئەگەر پزیشکی دادی بڕیاری بلاوکردنەوەی بۆ رای گشتی دا.

لە هەندێك حالەتی دیکەشدا بەتایبەت لەو رووداوانەی پەیوەندییان بە کەسوکاری هونەرمەند و گۆرانیبێژ و ناودارانەوە هەیە،هەندێ رۆژنامە بە ئامانجی بازاڕخۆشکردنی بلاوکراوەکەیان،ئەو رووداوانە بە قەبارەیەکی گەورەتر لەخۆیان بلاودەکەنەوە،خوێنەرانیش بەشەوقەوە بەدوای هەوالی لەوجۆرە دەگەڕێن هەتا گەر هەوالەکە ئاسایی و بێماناش بوو، بەشێك لە رۆژنامەنووسان و پسپۆرانی میدیا ئەو کارە بە دەستدرێژیکردنە سەر حورمەت و تایبەتمەندی هاولاتیان دادەنێن و داوا لە دەزگاکانی راگەیاندن دەکەن خۆیان لێ بەدوور بگرن.بۆ نموونە رۆژنامەیەکی ئەمریکی هەوالێکی دەربارەی کوڕی یەك لە سیناتۆرەکانی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا بلاوکردەوە کە بەهۆی ئیفلاسکردنەوە ناچار بووە پەنا بۆ ئەو خۆراك و کۆمەکە داراییە ببات کە دەولەت بۆ هەژارانی بڕیوەتەوە،لەرووی یاساییەوە هیچ سەرپێچییەك لەو کارەی کوڕی سیناتۆر بەدیناکرێت،بەلام بەلای بەرپرسی لاپەڕەکەوە ئەم بابەتە بەگرنگ داندراوە بۆیە بەو شێوەیە ئیبرازی کردووە،ئەندامەکەی ئەنجوومەنی پیران خوێندنەوەی ئەو هەوالە زۆر توڕەی دەکات و رایدەگەیەنێت دەبێ رۆژنامەکە رونکردنەوەی پێویست بلاوبکاتەوە،چونکە کرداری کوڕەکەی لەگەل ئەوەی هیچ سەرپێچییەکی یاسایی تێدا نیی،لە هەمانکاتدا ئەو لێی بەرپرسیار نییە و ژیانی تایبەتی خۆیەتی.بۆیە بەرپرسی لاپەڕەکە بۆ راستکردنەوەی بارودۆخەکە وتارێك بلاودەکاتەوە و بە ئاشکرا دابەزاندنی هەوالەکە بە هەلە ناوەبات.

بەلام لەو حالەتانەی کە کردار و هەلسوکەوتی خێزان یان کەسوکاری نزیکی ئەندام پەرلەمانێك یان سیاسییەك بەخراپی بەسەر ئەدای کاری ئەو سیاسییە یان پەرلەمانتارە دەشکێتەوە، بەو پێیەی پۆستەکەی پۆستێکی گشتییە،میدیا مافی خۆیەتی ئەو جۆرە رووداو هەلسوکەوتانە بخاتەڕوو و لێیان بێدەنگ نەبێت.

چۆنییەتی نووسینی ناو و ناونیشانی وەزیفی لە رۆژنامەکاندا

یەك لە توخمە پێویستەکانی نووسینی چیرۆکە رۆنامەوانییەکان،بەتایبەت هەوال و راپۆرتەکان،ناساندنی ناو و ناونیشانی ئەو کەسانەیە کە چاوپێکەوتنیان لەگەل دەکرێت یان لێدوانی کورتییان لێوەردەگیرێت.

جاران بەکارهێنانی وشەی(بەرێز)لە پێش ناوی ئەوانەی لە بابەتە رۆژنامەوانییەکان ناویان دەهێندرا شتێکی باو بوو،دواتر ئەم وشەیە لەگەل ناوهێنانی خەلکی ئاسایی لابردرا و تەنها

لەگەڵ ناوهێنانی ناو و ناونیشانی بەرپرسانی دەوڵەت دەنووسرا،بەلاّم لە ئێستادا رۆژنامەگەری وشەی(بەرێز)لە پێش ناو و ناونیشانی هیچ کەس و بەرپرسێك بەكارناهێنیٚ.هەروەها زۆر بەدەگمەن پەنا بۆ نووسینی نازناوەكان دەبات،یان ئەو وشە و سیفاتانەی هەستیاری و کەمکردنەوە بۆ خاوەنەکانیان دروست دەکەن.

نابیٚ رۆژنامەنووس ئەو سیفات و ئادگارانە بنووسێت کە گوزارشت بۆ رەنگ و رەگەز و تەمەنی کەسەکان دەکەن،تەنها لە هەندێك حاڵەتی دەگمەن نەبیٚ،چونکە بلاّوکردنەوەی ئەو جۆرە زانیارییانە هیچ خزمەتێك بە چیرۆکە رۆژنامەوانییەکە ناکات،بەڵکە کارێکە پەیوەندی بە پۆلیسەوە هەیە کاتێك بەدوای تۆمەتبارێکدا دەگەڕیٚ و راگەیاندراوێك بلاّودەکاتەوە و دەنووسێت(کەسی داواکراو رەنگ ئەسمەر، و بالاّ مامناوەندی،تەمەن ٣٠ ساڵانە...تد).

هەروەها پێویستە رۆژنامەنووس بە دیقەت و وردبینییەوە باس لە بلاّوکردنەوەی هەڵسوکەوتی شەخسی و لایەنی ئاکاری لایەنە پەیوەندارەکانی هەواڵ بکات، بەتایبەت گەر هاتوو ئەو مەسەلەیە پەیوەندی بە ناوەڕۆکی بابەتە رۆژنامەوانییەکەوە نەبوو،ساڵی ١٩٧٥ کاتێك یەك لە جەنگاوەرە دێرینەکانی ئەمریکا لە ولایەتی سانفرانسیسکۆ رێگری کرد لە هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆك(فۆرد)،رۆژنامەیەکی ناودار بۆ رۆژی دوایی راپۆرتێکی دەربارەی ئەو جەنگاوەرە بلاّوکردەوە، تیایدا هاتبوو، "ناوبراو کەسێکی لادەرە لەرووی سێکسییەوە و ئەندامی رێکخراوێکی لادەرە سێکسییەکانە"،کۆشکی سپی بەهۆی ئەم هەواڵەوە هیچ بروسکەیەکی سوپاسگوزاری ئاڕاستەی چەنگاوەرەکە نەکرد،بەلاّم رێکخراوە داکۆکیکارەکان لە مافی لادەرە سێکسییەکان پێشوازیان لە هەواڵەکە کردوو،ئەو کارەی جەنگاوەرە دێرینەکەیان وەك دەستکەوت بۆ تەواوی لادەرانی سێکسی ناوبرد،لەبەرامبەریشدا جەنگاوەرەکە توڕەیی و ناڕەزاییەکی توندی دەربڕی، و رۆژنامەکەی بە دەستدرێژیکردنە سەر حەرەم و تایبەتمەندی کەسی وەسفکرد،و بەهۆکاری ئاشکرابوونی ئەو نهێنییەی دانا.

لەراستیدا تا هەنوکە جەدەل و گفتوگۆکان دروستی و نادروستی ئەو جۆرە هەواڵانەیان یەکلانەکردۆتەوە،تەنها ئەوە نەبیٚ کە ئایا ئاکار و کەسایەتی کەسێکی پەیوەندار بە هەواڵ تاچەند پەیوەندی بە ناوەڕۆك و ئاڕاستەی رووداوەکانەوە هەیە؟لەو نمونەیەی سەرەوەدا جەنگاوەرە لادارەکە تاڕادەیەك پەیوەندی بە هەواڵەکەوە هەیە،بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا باسکردن لە لایەنی ئاکاری ناوبراو شتێکی زەروور نییە،وەك چۆن لەو کاتەی کەسێکی لادەر بەهۆی دەستدرێژی دزێکەوە دەبێتە قوربانی و دەکوژرێت،لەم حاڵەتەشدا باسکردن لە سیفەتە

ئاكارییەكانی قوربانییەكە كارێكی هەڵەیە.سەرباری هەموو ئەمانەش هێشتا زۆر لایەن و پرسیار هەن بە هەڵپەسێردراوی ماونەتەوە و بێ وەڵامن،لێرەدا تەنها خودی رۆژنامەنووس و ویژدانی سەرپشكن لە چۆنییەتی مامەڵكردن لەگەڵیان.

چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ وێنە رۆژنامەوانییەكان

دانانی وێنە لەگەڵ بابەتە رۆژنامەوانییەكان لێزانی و كارامەیی پێویستە،هەر وەك چۆن كرداری وێنەگرتن هونەرە و هەموو كەسێك پەیپێنابات،زۆرجار رۆژنامەنووس و دیزاینەری لاپەڕەكان دەكەونە دوودڵی و ڕاڕایی لە دانانی ئەو وێنانەی لەوانەیە بەهۆیانەوە ئازار و نارەحەتی بۆ خەڵكی دروست ببێ،وەك وێنەی تاوانەكانی كوشتن،یان سووتاندن،یان،رووداوەكانی هاتوچۆ،یان وێنەی قوربانیانی جەنگ...تد.

هەڵبژاردنی وێنە لە رۆژنامەدا رێسا و ئیتیكی تایبەت بەخۆی هەیە،ناكرێ وێنە دانان هەر لەپێناو پڕكردنەوەی لاپەڕەكان،یان سەرنجڕاكێشانی خوێنەر بێ،بەڵكە وێنەش هاوشێوەی وشە و پەیڤەكان،پەیام و دەلالەتی خۆی هەیە،لە هەندێ حاڵەتدا لە سەدان وشە بەهێزتر و كاریگەرترە.

راستە وێنە گرنگی و كاریگەری خۆی هەیە،بەلاّم پێویستە دانانی لە رۆژنامەكان بكەوێتە ژێر ركێڤی چەند پێوەر و بنەمایەك،نابێ رۆژنامەنووس تەنها لە گۆشەنیگای خزمەتگەیاندن بە ناوەڕۆكی هەواڵەكەوە مامەڵە لەگەڵ وێنەكە بكات،بەڵكە گرنگە رەچاوی زەوق و هەست و شعوری جەماوەر و لایەنی پەیوەندار بە وێنەكەوەش بكات،لێرەدا نموونەیەكی ئاژانسی هەواڵی (ئیسیۆشێد پرێس) دەخەینەروو تا بابەتەكە روونتر بێت،ئاژانسی ناوبراو لە دوا رۆژەكانی حوكمڕانی (كارتەر)دا دوو وێنەی دەربارەی ئەو هەوڵە سەرنەكەوتووە وەدەست كەوت كە لەرێگەی دوو فرۆكەوە هەوڵی رزگاركردنی بارمەتە ئەمریكییەكانی باڵیۆزخانەی ئەمریكای لە تاران دا،بەلاّم بەرێكەوت هەردوو فڕۆكەكە لە خاكی ئێراندا بەریەككەوتن، هەر هەشت سەرنشینەكەی نێویان گیانیان لەدەستدا،ئاژانسی (ئیسیۆشێد پرێس) كۆبوونەوەیەكی بەرفراوانی بۆ كارمەندانی گرێدا تا بڕیارێكی جەماعی لەسەر هەڵبژاردنی یەك لەو دوو وێنەیە بدەن،وێنەی یەكەمیان پاشماوەی دوو فڕۆكە تێكشكاوەكەی دەردەخست لەگەڵ جەستەی سوتاوی چەند كەسێك،وێنەی دووەمیش چەند پارچەیەكی فڕۆكەكان لەگەڵ جەستەیەكی سووتاو كە قوربانییەكە هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرزكردبوەوە،وەك ئەوەی لەخودا بپاڕێتەوە،بەلاّم هێشتا ئادگاری دەموچاوی نەشێوابوو و بە ئاسانی دناسرایەوەیەوە،كۆبوونەوەكەی ئاژانسی (ئیسیۆشێد

پریس) به زۆرینەی دەنگ بڕیاری لەسەر بلاْوکردنەوەی وێنەی یەکەم دا، و وێنەی دووەمی وەلانا ،بەبیانووی ئەوەی کار لە شعوری گشتی و کەس و کاری قوربانییەکە دەکات.کەواتە لێکدانەوەی رەهەندە دەروونییەکانی وێنەی کارەسات و رووداوەکان بەر لە بلاْوکردنەوەیان، کارێکی گرنگە و دەبێ رۆژنامەنووسان ئەو لایەنە بەهەند و گرنگ وەربگرن.

ئەمانەی خستمانەڕوو بنەما بنچینەییەکانی ئیتیکی کاری رۆژنامەوانین،هەوێن و کرۆکی ئەخلاْقیاتی میدیان،هەر میدیاکار و دەزگایایەك بیەوێت پرۆڤیشنالاْنە کاربکات،و ببێتە جێگەی متمانە و باوەڕی جەماوەر، دەبێ هەردەم ئەم بنەمایانەی لەبەرچاو بێ،و کارە رۆژنامەوانییەکانی بەو پێودانگە ئیتیکییانە پێوانە بکات.

# دەرووی پێنجەم

**مۆڕاڵە گشتییەکانی کارمەندانی بواری  رۆژنامەگەری و راگەیاندن .**

**بەشی یەکەم:ئیتیکی کارمەندانی بواری رۆژنامەگەری و راگەیاندن.**

**بەشی دووەم: ئیتیکی رێکلامکردن،وئیتیك لە رۆژنامەگەری کوردیدا**

## بەشی یەکەم

### ئیتیکی کارمەندانی بواری رۆژنامەگەری و راگەیاندن

لە ئێستادا ئیتیك و مۆراڵەکانی کاری راگەیاندن هێندە گرنگ و پڕبایەخن هیچ دەوڵەت و دەزگا و نێوەندێکی رۆژنامەوانی ناتوانێ پشتگوێیان بخات،بایەخدانی رۆژنامەنووس و ئەکادیمیستانی ئەو بوارە بە مەسەلەی ئیتیك وایکردووە کە هاوشانی دەوڵەت و سەندیکا و ئەنجوومەنە رۆژنامەوانییەکان،دەزگا رۆژنامەوانییەکانیش بایەخی تایبەتی پێبدەن و پەیپەری ئیتیکی تایبەت بەخۆیان رابگەیەنن،لەمەیش زیاتر پسپۆڕان مەسەلەکەیان تایبەتمەندتر کردووە بەوەی چەند مۆراڵێکی گشتییان بۆ سەرجەم کارمەندانی ئەو بوارە دەسنیشانکردووە و ناوی ئیتیکی کارمەندانی بواری رۆژنامەگەری و راگەیاندنیان لێناوە.

مەبەستیش لە ئیتیکی کارمەندانی بواری رۆژنامەگەری و راگەیاندن،مۆراڵ و شێوەی کارکردنی کارمەندانی ئەو بوارەیە هەر لە بەرپرس و بەڕێوەبەرانی دەزگا ئیعلامییەکان تا دەگاتە بچووکترین کارمەند،دیاریکردنی مۆراڵە گشتییەکانی کاری رۆژنامەنووس و میدیاکاران هەوڵێکە بۆ رێگەگرتن لە خراپ بەکارهێنانی میدیا بۆ بەرژەوەندی تایبەت،یان کەوتنە ژێرباری چەواشەکاری و ئیغراوە کە هەندێك نێوەند بەکاریدەهێنن بە ئامانجی رام و کۆنترۆڵکردنی میدیاکاران،مۆراڵە گشتییەکانی کارمەندانی راگەیاندن لە بنەڕەتدا چاودێری خودیی کارمەندانە بەسەر کارەکانیانەوە، ئینجا چاودێری ئەنجوومەن و سەندیکا ئیعلامییەکان.

سەرجەم کارمەندانی راگەیاندن،لە بەڕێوەبەر و سەرنووسەر و نووسەر و پەیامنێر و نێردراو و دیزاینەر و وێنەگر و ریکخەری ئەرشیف و کارمەندانی پرسگە و پیەوەندییەکان، لە کۆگایەك ئیش دەکەن کە کۆگای کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیارییەکان و گەیاندنیانە بە وەرگر یان جەماوەر،ئەو کارمەندانە وەك هەر کارەکتەرێکی دیکەی کۆمەڵگە دوور نییە لە میانی ئەنجامدانی کارەکەیان تووشی هەڵە و لادان بن،یان بکەونە ژێرباری ئیغرائاتی مادییەوە کە

دەرئەنجام زۆرخراپ بەسەر پەیامی میدیا و بەرژەوەندییە گشتییەکان دەشکێتەوە،لێرەوە ئەو مۆراڵە گشتییانە رۆڵی رادع یان بەربەستێکی زاتی دەبینن و بەردەوام وەك چاودێر لەگەڵ میدیاکارەوە دەبن،لەگەڵ هەر هەڵە و لادانێك ویژدانی دەهێننە جووڵە و رێگری لە هەڵەکردن دەکەن،بۆیە رۆڵی مۆراڵ یان ئیتیك لە رێکخستنی کاری میدیایی زۆر گرنگترە لە رۆڵی یاساکان،بەوپێیەی زۆر لە تەشریعاتە یاساییەکان کۆنترە،هەروەها لەبەر ئەوەی گرێبەستێکی ویژدانی خودیشە لە نێوان میدیاکار و پیشەکەی دوور لە دەسەلاتی دادوەر و لایەنی جێبەجێکار.

بۆیە لەم دەرووەدا رۆشنایی دەخەینە سەر ئیتیکی کارمەندانی ئەم بوارە، و مۆراڵە گشتییەکانی شێوەی کارکردنی یەکە یەکەی ناونیشانە رۆژنامەوانییەکان دەسنیشان دەکەین.

یەکەم:ئیتیکی کاری پەیامنێر و نێردە هەواڵییەکان

پەیامنێران بڕبڕەی پشتی کەناڵە ئیعلامییەکانن،لە رۆژنامە و رادیۆ و تەلڤزیۆن و سایتەکانی ئینتەرنێت،کاری ئەوان پەیوەندی بەردەوام و راستەخۆی بە سەرچاوەکانی هەواڵ و جەماوەرەوە هەیە،بۆیە کاری ئەوان لە هەر ناونیشانێکی دیکە زیاتر پێویستی بە تەنزیم و رێکخستن هەیە،ئیتیکی کاری پەیامنێران جەخت لەسەر دوولایەنی گرنگ دەکات ئەوانیش:

یەکەمیان:ئیتیکی پەیامنێر بەرامبەر سەرچاوەکانی زانیاری و هەواڵ :لەم لایەندا لەسەر پەیامنێر پێویستە پابەندی:

١/خراپەنەکردن بەرامبەر سەرچاوەکانی زانیاری،و بلاَونەکردنەوەی ناو و ناونیشانیان تەنها لەو حاڵەتانەی ژێدەر یان سەرچاوەکە خۆی حەز لە بلاَوکردنەوەیان بکات.

٢/پێویستە پەیامنێر پابەندی ئەو رێککەوتنە بێ کە لە نێوان ئەو و سەرچاوەی هەواڵ دەبەسترێت،بۆنموونە لە حاڵەتی پێدانی زانیارییەکی زۆر لە لایەن سەرچاوەیەکی دیاریکراوەوە بە پەیامنێر،بەلاَم دانانی مەرجێك کە نابێ پەیامنێرەکە هەموویان بەیەکجاری بلاَوبکاتەوە،دەبێ پەیامنێرەکە پابەندی ئەو رێککەوتنە بێ و بەش بەش زانیارییەکان دابەزێنێ.

دووەمیان:ئیتیکی گواستنەوە و بلاَوکردنەوەی زانیارییەکان:ئەم لایەنەیان بەرپرسیارییەتی هاوبەشە لە نێوان پەیامنێر و دەزگاکەی،بەلاَم پێویستە پەیامنێر ئەمین و راستگۆیانە زانیاری و هەواڵەکان وەك خۆیان بگەیەنێتە سەرنووسەر یان جێگرەکەی یان بەرپرسی لاپەڕەکەی،ئینجا ئەوەی دەمێنێتەوە شێوەی مامەڵەکردنی دەزگا رۆژنامەوانییەکەیە لەگەڵ هەواڵەکان کە ئایا:

١/هەموویان بەیەکجاری یان بەش بەش بلاَودەکاتەوە.

٢/بلاْوكردنەوەی بەشێوەیەكی حەرفی یان داڕشتنەوەی بەشێوازێكی دوور لە تێكستە ئەسڵییەكە.

٣/بلاْوكردنەوەی ناو و ناونیشانە پەیوەندارەكان بە ناوەڕۆكی زانیارییەكان و پارێزگاریكردن لە ناوە نهێنییەكان.

٤/گەمەكردن بە وشە لەكاتی داڕشتنی مانشێتەكان،دانانی مانشێتی سەرنجڕاكێش بەمەرجێك گوزارشت لە ناوەڕۆكی زانیارییەكان بكات.

پەیامنێر بەرپرسیارییەتییەكی هەستیاری لە ئەستۆیە،ئەو تەنها گوێزەرەوەی هەواڵ نییە،بەڵكە خودان هەستی جەمعی و نیشتمانییە،بۆیە دەبێ جێپەنجەی دیاری لە شێوازی بلاْوكردنەوەی هەواڵ و زانیارییەكان هەبێ،و بەرپرسانی دەزگاكەی ناچاربكات پابەندی ئەو ڕێككەوتنەبن كە ئەو لەگەڵ سەرچاوەكانی هەواڵ گرێیداوە.

بەكورتی مەسەلەی گواستنەوەی هەواڵ شتێكی قورس نییە،بەڵكە قورستر لەو شێوەی مامەڵكردن و بلاْوكردنەوەیەتی،چونكە هەواڵ تا ساتەوەختی بلاْوكردنەوەی پەیڤێكی مردووە،بەلاْم ئەوە جۆری هەواڵەكە و شێوەی خستنەڕوویەتی،گرینگی و هەستیاری پێدەبەخشێت.

## دووەم:ئیتیكی كاری سەرنووسەر

سەرنوسەر بەرپرس و بڕیاردەری سەرەكی رۆژنامە یان گۆڤارەكانە،هیچ رۆژنامە و گۆڤارێك بێ سەرنووسەر نابێ،ئەو بەرپرسی یەكەمە،هەروەك چۆن بڕیاری ئەوەل و ئاخیری بلاْوكردنەوەی بابەتە رۆژنامەوانییەكان لەدەست ئەودایە،سروشتی كاری سەرنووسەر كۆمەڵە مۆڕاڵێك هەڵدەگرێت ئەوانیش:

١/سەرنوسەر بەرپرسە بەرامبەر بە یاسا دەربارەی ئەو بابەتانەی لە رۆژنامە یان گۆڤارەكەی بلاْودەبنەوە،ئەم بەرپرسیارییەتەشی هیچ لە دەسەلاْتی سكرتێری نووسین و نووسەر و بەرپرسی لاپەڕە و پەیامنێران كەمناكاتەوە.

٢/پێویستە سەرنووسەر ناوی تەواوی بلاْوكراوەكەی و ژمارە و رێككەوت و شوێنی دەرچوون و ژمارەی لاپەڕەكانی لە شوێنێكی دیار،روون و رەوان بنووسێ.

٣/لەو بابەتانەی پێویستیان بە بەڵگە و دێكۆمێنت هەیە، پێویستە سەرنووسەر داوا لە نووسەری بابەتەكە،یان پەیامنێر بكات بابەتەكەی بە دێكۆمێنتەكان دەوڵەمەند بكات.

٤/ئەگەر خاوەن ئیمتیاز لە کاتی تەنگانەدا دەستی بیمە و یارمەتی بۆ کارمەندان درێژنەکرد،دەبێ سەرنووسەر یارمەتیدانیان بگرێتە ئەستۆ.

٥/ لەکاتی دروستبوونی کێشە و گرفت بۆ رۆژنامەنووسان بەهۆی راپەڕاندنی کارەکانیان،پێویستە سەرنووسەر لاگیرییان لێبکا و پشتیان تێنەکات.

## سێیەم:ئیتیکی کاری داڕێژەرانی هەواڵ(محرر):

خەسیەتەکانی کەسایەتی(محرر)ئەو مۆڕالانە لەخۆدەگرێت:

١/بنەماکانی راستگۆیی و دەستپاکی، مۆڕاڵە گشتییەکانی کاری رۆژنامەوانین کە سەرجەم کارمەندانی ئەو بوارە دەگرێتەوە لە پەیامنێر و نووسەر و هەڵەچن تا دەگاتە سەرنووسەر و سکرتێری نووسین.

٢/وردبینیکردن لە داڕشتنی زانیارییەکان،بەتایبەت ئەوانەی داتا و ژمارەن،خۆبەدوورگرتن لە شێواندنی ناوەڕۆکی زانیارییەکان بەدەستی ئەنقەست.

٣/نهێنی پارێزی و پارێزگاریکردن لە هەندێ زانیاری و سەرچاوەی هەواڵ،بەتایبەت ئەوانەی کە بەپاساوی زەرەرگەیاندن بە بەرژەوەندی گشتی بلاْوناکرێنەوە.

٤/گەورەنەکردنی زانیاری و هەواڵەکان لە قەبارەی ئاسایی خۆیان،یان دانەڕشتنیان بە زمان و ئسلوبێك کە ترس و دڵەڕاوکێ لای وەرگر بجولقێنێ،هەروەها داڕشتنی مانشێتەکان بەشێوازێك گوزاشت لە ناوەڕۆکی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان بکات.

## چوارەم:ئیتیکی کاری بەڕێوەبەری TV و رادیۆکان

ئەرکە گشتییەکانی راگەیاندن دەکەوێتە ئەستۆی بەڕێوەبەری **TV** و رادیۆکان بەم شێوەیەی خوارەوە:

١/پێویستە لە پێناو راستی هەوڵبدەن، دژایەتی درۆ و چەواشەکاری بکەن.

٢/لە رێکلامکردندا رەچاوی جۆر و کوالێتی ئەو کالاْیە بکەن کە رێکلامی بۆ دەکەن.

٣/پشتگیری لە هەوڵەکانی چەسپاندنی مافی مرۆڤ بکەن.

٤/بەرپرسی سەرەکین لە بلاْوکردنەوەی بابەت و زانیارییەکان.

٥/لەکاتی بلاْوکردنەوەی هەواڵ و راپۆرت و وتارە رۆژنامەوانییەکاندا،رەچاوی مافە تایبەتییەکانی تاك و ئاسایشی نەتەوەیی و بنەماکانی مافی مرۆڤ بکەن.

٦/بەبێ ئاگادارکردنەوەو مۆڵەت وەرگرتن، هەواڵی رۆژنامە و دەزگاکانی دیکە بلاۆونەکەنەوە.

٧/نابێ رادیۆ و TVتەنها لە خزمەتی زۆرینەدابن و کەمینەکان پشتگوێبخەن،یان ببنە هۆکاری تواندنەوەی ناسنامە و کەلتووری نەتەوەییان.

٨/نابێ پارە و بەرتیل لەبەرامبەر بلاۆکردنەوەی هەواڵ و رووماڵکردنی رووداوەکان وەربگرن.

## پێنجەم:ئیتیکی کاری وێنەگر

وێنەگران جا فۆتۆگرافەربن یان تەلفزیۆنی و سینەمایی،بەشێکن لە پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری و بلاۆکردنەوەیدا، ئەوان هاوبەشن لە کاری پەیامنێران و دارێژەرانی هەواڵ،بە واتایەکی دیکە وێنەگر لە رێگەی گرتە وێنەییەکانییەوە لەیەك کاتدا پەیامنێر و دارێژەری هەواڵە.وێنەگری رۆژنامەوانی تەنها وێنەگرێکی ئەماتۆری ئاسا نییە،بەڵکە بەرپرسیارییەتی پیشەیی لە ئەستۆیە،کە وابەستەی کۆمەڵە مۆراڵێکە،دەکرێ لەمانەی خوارەوەدا کۆیان بکەینەوە:

١/وێنەنەگرتنی هیچ کەسێك بەر لە وەرگرتنی رەزامەندی خاوەنەکەی.

٢/پێویستە لە حاڵەتی جووڵە و قسەکردندا وێنەی بەشداربووانی هەواڵ یان راپۆرتەکان بکێشێ نەك بە ئارەزووی خۆی جووڵە و گرتەیان لێوەربگرێ.

٣/پێویستە وێنە کەسییەکان بە جۆرێك بلاۆبکرێنەوە زەرەر و زیانی مەعنەوی و کۆمەلاٌیەتی بە خاوەنەکانیان نەگەیەنن.

٤/نابێ وێنەگری رۆژنامەوانی ببێتە ئامرازی تەشهیر و ناوزڕاندنی خەڵکی،یان وێنەکانی بۆ خزمەتی دەزگایەکی سیخوری مەیسەر بکات.

## شەشەم:مۆڕاڵە گشتییەکانی وتارنووسانی رۆژنامەوانی

وتار ژانرێکی سەرەکی ژانرە رۆژنامەوانییەکانە،تەواوکەری هەواڵ و راپۆرتەکانە لە گەیاندنی زانیاری و هەواڵ بە وەرگر،ئەوەی وتاری رۆژنامەوانی لە هەواڵ جیادەکاتەوە زاڵبوونی بیروبۆچوون و شرۆڤەی نووسەرە بەسەر ناوەڕۆکی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکە،وەزیفەی سەرەکی وتارنووس پێڕاگەیاندن و رۆشنبیرکردن و ئاڕاستەکردنی خوێنەرە دەربارەی پرس،یان رووداوێکی دیاریکراو،وتار رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە تێکەڵنەکردنی بیروبۆچوونی شەخسی بە هەواڵ و راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان،بە پانتاییەکی گونجاو دادەندرێت بۆ تەعبیرکردن لە بیروبۆچوونی

نووسەر و رۆژنامەنووسان،یان گوزارشتکردن لە سیاسەتی رۆژنامەوانی بلاّوکراوەکان لەڕێگەی ئەو وتارانەی کە بە سەروتار ناودەبرێن.

پسپۆران چەند مۆراڵێکیان وەك ئەخلاّقیاتی نووسەرانی رۆژنامەنووسی داناوە کە پێویستە وتارنووسان لەکاتی نووسیندا لەبەرچاوی بگرن،ئەوانیش بریتین لە:

١/رێزگرتن لە ئایین و ئایینزاکان،و کەمنەکردنەوە لە بیروبۆچوون و موعتەقەداتی خەڵکی دیکە.

٢/خۆدوورخستنەوە لەو بابەتانەی دەبنە مایەی نانەوەی تۆوی دوبەرەکی رق و کینە لە نێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگە.

٣/شەن و کەونەکردنی ئەو بابەت و مەسەلانەی هێشتا دادگاکان بڕیاری یەکلاکەرەوەیان لەبارەوەیان نەداوە.

٤/داکۆکیکردن لە مافە بنەڕەتییەکانی هاولاّتیان وەك ئازادییەکان و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ.

٥/خستنەڕووی کێشە و گرفتەکانی هاولاّتیان، و شرۆڤەکردنی پرسە سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی و کلتوورییەکان.

٦/رەچاوکردنی مەوزوعیەت لە تاوتوێکردنی بابەتەکان،بەتایبەت بابەتە رەخنەییەکان،یان ئەوانەی باس لە کەسایەتییەکان دەکەن.

٧/لەکاتی وەرگرتنی هەر زانیاری و وتەیەك و بەکارهێنانی لە وتاردا،پێویستە وتارنووس ئاماژە بەناوی سەرچاوەکە بدات،جا کتێب بێ یان وتار یان بابەتەکانی ئینتەرنێت.

٨/رەتکردنەوەی هەر جۆرە پاڵەپەستۆ و گوشارێك لەلایەن رۆژنامە و گۆڤارەکانەوە لە حاڵەتی فەرزکردنی بیروبۆچوون و سیاسەتە رۆژنامەوانییەکانیان بەسەر وتارنووساندا.

٩/رەتکردنەوەی هەموو شێوەکانی دیاری و داوەت و گەشتکردن و هەموو شێوە ئیمتیازێکی دیکە کە ببنە مایەی تەنازولکردنی نووسەر لە بیروبۆچوونەکانی،یان بانگەشە و پڕوپاگەندەکردن بۆ لایەن یان کەسێکی دیاریکراو.

١٠/بلاّونەکردنەوەی شتی ناڕاست، و نەشێواندنی راستییەکان.

١١/رێزگرتن لە خوێنەر،و کەمنەکردنەوە لە توانا و بیروبۆچوونەکانی.

١٢بەجێگەیاندنی وەزیفەی پێڕاگەیاندن و رۆشنبیرکردن و ئاڕاستەکردن بەرامبەر بە خوێنەر.

١٣/پێویستە بە زمان و ئسلوبێكی وا بنووسێت تەواوی خوێنەران تێیبگەن.
١٤/بەكارنەهێنانی وشە و دەستەواژەی نارێك و نەگونجا و دوور لە داب و ئاكاری گشتی.
١٥/بەكارهێنانی ناوی راستەقینە، و خۆبەدوورگرتن لە نووسینی ناوی خوازراو.

## حەوتەم:ئیتیكی كارمەندانی پەیوەندییە گشتییەكان:

كارمەندانی پەیوەندییە گشتییەكان بە ئەركێكی گرنگ لەهەمان كاتدا ترسناك هەڵدەستن،چونكە ئەوان لە پەیوەندی و كۆنتاكتی بەردەوامدان لەگەڵ كەسایەتی و نێوەند و دەزگا حكومی و تایبەتییە جۆربەجۆرەكان،فراوانی كاری ئەوان و تێكەڵاوی رادەبەدەریان، وایكردووە لە هەر كارمەندێكی دیكە زیاتر رووبەرووی هەڵخەڵەتاندن و لادان ببنەوە،بۆیە لەپێناو بەرگرتن لە هەڵەكردن،دەزگا ئیعلامییەكان ئەو كارمەندانە وابەستەی گرێبەستێكی ئاكاری دەكەنەوە،كەخۆی لە قەدەغەكردنی قەبولكردنی پارە و گەشتی بەخۆرایی و دیاری دەبینێتەوە.

## هەشتەم:ئیتیكی بەكارهێنانی ئینتەرنێت

رۆژ لەدوای رۆژ پێویستی كۆمەڵگە و دەزگا رۆژنامەوانییەكان بۆ ئیتك و بنەما ئاكارییەكانی كاری میدیایی زیاتر دەبێ،لە دایك بوونی میدیای ئەلیكترۆنی ئەهەمییەتی ئەو پرسەی هێندەی دیكە گەورەتر كردووە بەو پێیەی تا هەنووكە لە زۆرینەی وڵاتان یاسایەك نیە كاری میدیای ئەلیكترۆنی رێكبخات،هەروەها لەبەر ئەوەیش سروشتی میدیای نێوبراو دوورە لە عەقلانیەت و پێودانگە پەیڕەوكراوەكانی ئەو بوارە.

لە هەشتاكانی سەدەی رابردووەوە ئینتەرنێت و تەكنەلۆژیای ژمارەیی لە پێشڤەچوونی خێرادایە،بەهۆی ئینتەرنێتەوە سنوورە جوگرافییەكان كاڵبوونەتەوە،و مرۆڤ لەهەر شوێنێكی دونیابێ بە ئاسانی و لە ماوەی تەنها چەند چركەیەك دەتوانێ پەیوەندی بەهەر كەسێكەوە بكات كە مەبەستی بێ،یان هەر جۆر و شێوە هەواڵ و زانیارییەك تەنها لە رێگەی كەبسەی سەرە پەنجەیەوە وەدەست بێنێ،لەمەیش زیاتر دەتوانێ كۆمێنت و بیروڕاش دەربارەی هەواڵ و زانیارییەكان بلاۆبكاتەوە،واتا خوێنەر لەسایەی میدیای ئەلیكترۆنییەوە تەنها وەرگر نیە،بەڵكە بەشداربووشە،قسە و بۆچوونی خۆی هەیە دەربارەی رووداوەكان و بلاۆیان دەكاتەوە.ئەم شۆڕشە ئیعلامی و تەكنەلۆژییە كاریگەری راستەخۆی لەسەر كلتوور و عادات و تەقالیدی كۆمەلاّیەتی و لایەنی سیاسی و ئابووریش هەیە،بەبڕوای من كاریگەری و رەنگدانەوەی ئینتەرنێت و

تەکنەلۆژیا لەسەر گەلان هێشتا لە قۆناخی سەرەتایدایە،و مرۆڤایەتی لە (١٠)ساڵی داهاتوودا کاریگەری و گۆڕانکاری قووڵتر و بەهێزتر بەخۆوە دەبینێ.

میدیای ئەلیکترۆنی خودان کۆمەڵە تایبەتمەندییەکە کە لە میدیای پێشتری جیادەکاتەوە و خسوسیەتی پێدەبەخشێت،ئەوانیش:

١/تایبەتمەندی:بەکارهێنەری ئینتەرنێت تەنها خۆی لە رێگەی کۆمبیوتەری تایبەتی خۆیەوە وەرگری هەواڵ و زانیارییەکانە،کەس ناتوانێ بەشداری وەرگرتنی هەواڵی لەگەڵدا بکات،یان ببێتە چاودێر و رەقیب بەسەرییەوە.

٢/ئینتەرنێت کەرەستەیەکی میدیایی دووسەرەیە بە پێچەوانەی رادیۆ وTV و رۆژنامەکان،واتە بەکاربەر دەتوانێ وەك کەرەستەی پەیوەندیکردنیش بەکارییبێنێ،هەروەها دەتوانێ بەشداربێ لە رووداو و هەواڵەکان لەڕێگەی تەعلیقدان لەسەریان.

٣/توانایەکی بەهێزی هەیە لە گەیشتن بە شتە قەدەغەکراو و سانسۆرەکان،و بەزاندنی تایبەتمەندییەکانی تاك و خێزان.

بەلەبەرچاوگرتنی ئەو هەموو گرنگی و تایبەتمەندییە،پسپۆرانی میدیا ئیتیکی بەکارهێنانی ئینتەرنێتیان بەسەر دوو لایەن دابەش کردووە:

یەکەم:ئیتیکی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لەنێوان بەکاربەر و خودی خۆیدا:ئەو لایەنە پەیوەندارە بە ویژدان و کەسایەتی و مۆڕاڵی بەکاربەر،واتە تەنها ئەو بەرپرسە لە سلوك و کردارەکانی خۆی،بێ هەبوونی هیچ گوشار و هێزێك چاودێری بکات،بۆیە پێویستە لەسەری:

١/پارێزگاریکردن لە خۆی بەهۆی ئەو کارانەی لەرێگەی بەکارهێنانی ئینتەرنێتەوە رووبوڕووی دەبنەوە،بە واتایەکی دیکە خۆدوورخستنەوە لە هەر جۆرە مەترسییەکی جەستەیی و مەعنەوی.

٢/بەکارنەهێنانی ئینتەرنێت لە شتی پڕوپوچ و بێ سوود.

٣/کات بەفیڕۆنەدانی زیاد لە پێویست لەبەکارهێنانی ئینتەرنێت.

٤/زیان نەگەیاندن بە جەستەی خۆی،ناوە ناوە پشودان لە کاتەکانی بەکارهێنانیدا.

دووەم:ئیتیکی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لەنێوان بەکاربەر و کەسانی دیکەدا:ئەم لایەنەیان لایەنێکی جێبەجێکارییە،ویژدان و ئاکار لای هەموو کەسێك نابنە رێگر لە خراپ بەکارهێنانی ئینتەرنێت،بۆیە پێویستی بە تەشریعات و یاسا هەیە تا بەکاربەر مولزەم بکەن لەو بابەتانەی پەیوەندییان بە خاوەندارییەتی فیکرییەوە هەیە.

لەلایەکی دیکەوە،پسپۆران بەشێکی زۆر لە هەڵسوکەوت و کرداری بەکاربەرانی ئینتەرنێت،بەتایبەت ئەوانەی پێچەوانەی زەوق و دابی گشتیین بە تاوان هەژماردەکەن،و پێیان وایە خراپ بەکارهێنانی سەرچاوەی چەندین تاوان و لادانە کە لە کۆمەڵە خاڵێك کۆیان کردۆتەوە ئەوانیش:

١/دەستدرێژیکردنە سەر ژیانی تایبەتی.

٢/ناردنی ئیمێلی نادروست و نا ئەخلاقی .

٣/کردنەوەی پەیجە سێکسییەکان.

٤/بلاۆکردنەوەی هزر و بیروبۆچوونی جیاکاری و رەگەزپەرستانە.

٥/راگرتنی کۆمبیوتەری خەڵکی لەرێگەی ڤایرۆسەوە.

٦/هاککردن

٧/ڤایرۆس بلاۆکردنەوە و دزینی زانیاری.

٨/خۆگۆڕین و دانانی پەیج و ئەدرێسی ئەلیکترۆنی بەناوی خوازراو، یان بەناوی خەڵکی دیکە.

٩/بلاۆکردنەوەی فیلمی رووت و بەدرەوشتی.

١٠/راوەدوونان و ئیزعاجکردنی خەڵکی.

١١/دزین و قۆڵبڕین.

١٢/دەستدرێژیکردنە سەر موڵك و ئاسایشی گشتی.

## نۆیەم:ئیتیکی مامەڵەکردن لەگەڵ قوربانیانی تاوان و کارساتە دڵتەزێنەکان

بەشێوەیەکی گشتی ئیتیکی کاری رۆژنامەگەری و راگەیاندن رێگە بەبلاۆکردنەوەی ناو و ناسنامەی قوربانیانی تاوان و کارەساتەکان نادات،تەنها لەو حاڵەتانە نەبێ کە تاوان یان کارەساتەکە بایەخی مێژوویی هەبێ،و بلاۆکردنەوەی سوود بەبەرژەوەندی گشتی بگەیەنێت،بۆنموونە بلاۆکردنەوەی ناو و وێنەی کەسێك کە هەوڵی خۆکوشتنی داوە بەزاندنی مافی تایبەتی تاکە کەسە،بەلاّم گەر بلاۆکردنەوەی قازانجی بۆ بەرژەوەندی گشتی هەبێت دەکرێ ناوی قوربانییەکە بلاۆبکرێتەوە بێ بلاۆکردنەوەی وێنە و زانیاری دیکە.

سەبارەت بە ئیتیکی مامەڵەکردنیش لەگەڵ کەسوکاری مردوان و خاوەن پرسەکان،پسپۆران کۆمەڵە خاڵێکیان دەسنیشان کردووە دەبێ میدیاکاران رەچاویان بکەن

،بەوپێەی ئەو جۆرە مرۆڤانە لەو حاڵەتانەدا لە بارێکی دەروونی نائاسایی و قورسدا دەژین وپێویستیان بە موراعاتکردن هەیە،بەگشتیش ئەو خاڵانە بریتین لە:

١/خاوەن پرسە دەتوانێ چاوپێکەوتن ئەنجام نەدات.

٢/دوای تۆمارکردنی راپۆرت و فیلمەکان دەتوانن پەشیمان ببنەوە و داوای سڕینەوەی ناو و وێنەکانیان بکەن.

٣/نابێ مندالّ بەشداری گفتوگۆ و چاوپێکەوتنەکان بکات.

٤/قوربانیان و زیانبەرکەوتووانی کارەسات بۆیان هەیە هەر کات ویستیان کۆتایی بە چاوپێکەوتن گفتوگۆکردن بێنن.

٥/کاتێك هەواڵ و زانیاری نادروست دەربارەیان بلاّوبکرێتەوە،بۆیان هەیە نارەزایی دەرببڕن و داوای راستکردنەوەی بکەن.

٦/دەتوانن ئەو پرسیارانە وەلاّم نەدەنەوە کە پێی نارەحەت دەبن،یان ئاسایشیان دەخاتە مەترسییەوە،یان پەیوەندی بەوانەوە نییە.

٧/نابێ رۆژنامەنووس گوشاریان بخاتە سەر بۆ وەلاّمدانەوەی پرسیارەکانیان و ئینتەرڤیوکردن،بەلاّم دەتوانێ ئەدرێس و ژمارەی مۆبیلی خۆی پێیان بدات تا گەر پەشیمان بوونەوە پەیوەندی پێوەبکەن.

٨/گەر قوربانییەکە خۆی توانای بڕیاردانی نەبێت،پێویستە رۆژنامەنوسەکە مۆڵەت لە کەسوکاری وەربگرێت بۆ بلاّوکردنەوەی وێنە و زانیاری دەربارەی.

٩/لە ساڵوەگەر و یادکردنەوەکاندا نابێ رۆژنامەنووس ئەو قسە و رووداوانە بگێڕێتەوە کە دەبنە مایەی برین کولانەوە و خەفەتباری بۆ کەسوکاری قوربانییەکە.

١٠/نابێ باس لە بارودۆخی جەستەیی و خراپی لەش و لاری قوربانییان لە دەزگاکانی راگەیاندن بکرێت.

١١/پەیامنێران و ئامادەکارانی ریپۆرتاژە تەلڤزیۆنییەکان دەبێ لەکاتی وێنەگرتنی مەراسیمی بەخاسپردن و پرسەدا رەچاوی لایەنی دەروونی کەسوکاری قوربانیان بکەن.

١٢/دەبێ رۆژنامەوان،بەر لە بلاّوکردنەوەی هەواڵ و زانیارییەك،پێشوەخت سەرنووسەر یان بەرپرسی دەزگاکەی لە هەستیاری وێنە و جۆری ئەو زانیارییانە ئاگاداربکاتەوە کە دەربارەی قوربانیان یان کەسوکاریان بە دەزگاکەی دەدات.

١٣/بلاْوكردنەوەی وێنە و مەراسیمی بەخاسپاردنی هەر کەسێك بێ وەرگرتنی رەزامە ندی خاوەنەکەی بە پێشێلکردنی مافی تایبەتی هەژمار دەکرێت.

**دەیەم:ئیتیکی مامەڵەکردنی میدیاکار لەگەڵ منداڵان**

میدیا بەهەموو جۆرەکانییەوە کاریگەری راستەوخۆی لەسەر هەڵسوکەوت و کەسایەتی منداڵ هەیە،هەر بۆیە یەکیەتی رۆژنامەنووسانی نێودەوڵەتی کۆمەڵە خاڵێکی ئیتیکی دەسنیشان کردووە پێویستە رۆژنامەنووسان لەکاتی ئامادەکردنی ئەو راپۆرت و بەرنامانەی پەیوەندیان بە منداڵانەوە هەیە لەبەرچاوی بگرن،یەکیەتی ناوبراو روون و ئاشکرا داوا لە میدیاکاران دەکات ئەوپەڕی میهەنیەت و وردبینی لە کارەکانیان تایبەت بە منداڵان پەیڕەو بکەن،و هەر دەستدرێژیکردنێکیش بۆ سەر تایبەتمەندی و رەفاهیەت و کەسایەتی و مافی منداڵان بە دەستدرێژیکردنە سەر بەشێکی سەرەکی و زیندووی کۆمەڵگە هەژمار دەکا کە پێویستی بە لێپێچینەوە و سزادانە.

ئیتیکی مامەڵەی میدیاکاران لە دیدی یەکیەتی نێودەوڵەتی رۆژنامەنووسانەوە، لەو بابەت و بەرنامە و راپۆرتانەی پەیوەندارن بە منداڵانەوە، لەو کۆمەڵە خاڵە بەرجەستە دەبێت:

١/بلاْونەکردنەوەی ئەو وێنانەی زەرەر بە سایکۆلۆژیەت و سلوکی منداڵ دەگەیەنن.

٢/بەکارنەهێنانی وێنەی ئەو منداڵانەی کە نیمچە رووتن و دەبنە مایەی وروژانی سێکسی منداڵانی دیکە.

٣/وردبینیکردن لە بەڵگەنامەی ئەو رێکخراوانەی خۆیان بە نوێنەر و داکۆکیکار بە منداڵان دەناسێنن بەر لەوەی لێدوان و زانیارییان لێوەربگیرێت.

٤/پارەنەدان بە منداڵان یان کەسوکاریان لەبەرامبەر هاندانیان بۆ بەشداریکردن لە بەرنامە و راپۆرتە رۆژنامەوانییەکان.

٥/پێویستە دەزگا رۆژنامەوانییەکان بەوردی بەدواداچوون بۆ بەڵێن و قسەکانی حکومەت بکەن دەربارەی پابەندبوونی بە پەیماننامەکەی نەتەوەیەکگرتووەکان تایبەت بە مافەکانی منداڵان،لەکاتی هەبوونی هەر سەرپێچییەك رای گشتی لێئاگاداربکەنەوە.

٦/هەڵسەنگاندنی ورد بۆ هەر بابەتێکی منداڵان بەر لە بلاْوکردنەوەی لە دەزگاکانی راگەیاندن.

## یانزەهەم:ئیتیکی چوونە نێو نەخۆشخانە و مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشان

نەخۆشخانەکان شوێنێکی باشی کۆکردنەوەی هەواڵ و بابەتە رۆژنامەوانییەکانن،بەلاّم چوونە نێو نەخۆشخانە تایبەتمەندی خۆی هەیە،کاری رۆژنامەوانی میدیاکار لە نەخۆشخانەدا وەك شوێنە گشتییەکانی دیکە نییە،پێویستە رۆژنامەنووس پابەندی کۆمەڵە پرەنسیپ و ئیتیکێك بێ لەکاتی چوونە نەخۆشخانە،و گفتوگۆکردن لەگەڵ نەخۆش و کارمەندان،ئەو پرەنسیپانەش بریتین لە:

١/پێویستە رۆژنامەنووس بەر لەچوونە نێو نەخۆشخانە و بەشە جیاجیاکانی،مۆڵەت لە بەرێوەبەر یان بەرپرسی نەخۆشخانەکە وەربگرێت.

٢/نابێت رۆژنامەنووس لەپێناو چوونە نێو نەخۆشخانە و گفتوگۆکردن لەگەڵ نەخۆشان،ناسنامەی خۆی بگۆرێت،وەك ئەوەی خۆی بکاتە خزم و ناسیاوی نەخۆشەکان.

٣/نابێت بێ وەرگرتنی مۆڵەت لە بریندار و نەخۆشەکان دەنگیان بلاّوبکاتەوە.

٤/لەوانەیە هەندێکجار رۆژنامەنووس بتوانێ وێنەی کەسێکی کوژراو یان بریندار لە نەخۆشخانە وەربگرێت،بەلاّم بۆی نییە بێ وەرگرتنی رەزامەندی کەسوکاریان بلاّویبکاتەوە.

٥/پێویستە میدیاکار پەلە نەکات لە بلاّوکردنەوەی ئەو هەواڵ و زانیارییانەی لە زاری کەسێکی بریندار یان نەخۆشەوە وەریدەگرێت چونکە ئەوان لە حاڵەتێکی ناسروشتیدان،دەبێ تەواو لە زانیارییەکان بکۆڵێتەوە ئینجا بلاّویان بکاتەوە.

## دوانزەهەم:ئیتیکی مامەڵەکردن لەگەڵ دۆسییەکانی دادگا

رۆژنامەنووس بە نوێنەرایەتی خەڵك ئامادەی دانیشتنەکانی دادگا دەبێت،بۆیە دەبێ وەك چاودێرێکی چالاك و وردبین هەڵسەنگاندن بۆ لێکۆڵینەوەکانی دادوەری بکات و بە ئەرکی خۆی هەڵبستێت.

پسپۆرانی میدیا پێیان وایە چاودێری میدیا لەسەر دانیشتنەکانی دادگا و لێکۆڵینەوە چەندین ئیجابیات و خاڵی ئەرێنی هەیە،بەلاّم ئەو چاودێرییە نابێ بەشێوەیەکی هەرەمەکی تەنزیمنەکراو بێ،بەڵکە پێویستە لە چوارچێوەی بنەما ئیتیکییەکانی ئەو بوارە بێ کە چەند خاڵێکی سەرەکی لەخۆدەگرێت،ئەوانیش:

١/نابێ رۆژنامەوان زانیاری ئەوتۆ دەربارەی دۆسییەکانی دادگا و لێکۆڵینەوە بلاّوبکاتەوە بەشێوەیەك کار بکاتە سەر رێچکەی لێکۆڵینەوەکان.

٢/نابێ بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان کاربکەنە سەر بڕیارەکانی دادوەر،یان کاریگەری خراپ لەسەر بڕیارەکانی دروست بکەن.

## سێنزەهەم:ئیتیکی پەیوەندی نێوان میدیا و حکومەت

بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی نێوان دەسەلاّت و میدیا پەیوەندییەکی ناجێگیر و کێشەدارە،میدیا لەسەرانسەری دونیادا خاوەن پەیوەندییەکی ئالۆزە لەگەڵ دەسەلاّتە سیاسی و سەربازی و تەشریعی و دادوەرییەکاندا،هەموو کات ئەو دەسەلاّتانە لەگەڵ دەسەلاّتی ڕۆژنامەگەری کە بەدەسەلاّتی چوارەم ناودەبرێت وەك نەیار و دژبەیەك تەماشا دەکرێن،هەربۆیە لەپێناو ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان دەسەلاّت و میدیا،پسپۆرانی ڕۆژنامەگەری چەند بنەمایەکی ئەخلاقیيان دەسنیشان کردووە کە بریتین لە:

١/واباشە ڕۆژنامەوان بەردەوام لە پەیوەندی باش و ڕێك و پێك دابێ لەگەڵ ئاژانس و دامودەزگا حکومییەکان و بەرپرسانی دەوڵەت لەپێناو زامنکردنی وەدەستهێنانی هەواڵ و زانیاری.

٢/نابێ میدیا لە پێناو وەدەستهێنانی زانیاری خۆی بکات بە خزمەتکار و بڵندگۆی دەسەلاّت.

٣/نابێ بەبێ هەبوونی کێشە و گرفت،یان لەسەر قسە و زانیاری ناتەواو، ڕۆژنامەنووس سەنگەر لە حکومەت بگرێ،یا بەردەوام هێرش و ڕەخنەی لێبگرێت بێ هەبوونی هۆکارێکی مەنتیقی بۆ ڕەخنەگرتن.

٤/لەسەر دەسەلاّت پێویستە زامنی ئازادی ڕۆژنامەگەری و مافی گەیشتنی ڕۆژنامەنووسان بەسەرچاوەکانی زانیاری و هەواڵ بکات.

بەکورتی،باشترین ڕێگەچارە لەپێناو ڕاگرتنی پەیوەندی نێوان میدیا و دەسەلاّت بەشێوەیەکی هاوسەنگ،چاودێریکردنی میدیایە بەسەر کارو چالاکییەکانی حکومەتەوە بەشێوازێکی مەوزعی و بەرپرسانە،دوور لە هەڵشەیی و پەلەکردن،لەگەڵ دانبەخۆداگرتنی دەسەلاّت بەرامبەر ئەو ڕەخنە و گلەییانەی لەلایەن میدیایەوە ئاڕاستەی دەکرێن.

## بەشی دووەم

## ئیتیکی ڕێکلامکردن،و ئیتیك لە ڕۆژنامەگەری کوردیدا

### یەکەم:ڕێکلام..جۆر و ئامانجەکانی

ئەمڕۆ ڕێکلام حزورێکی بەرچاوی لە پرۆسەی گەیاندن و پێڕاگەیاندنی جەماوەریدا هەیە،بەشێکی سەرەکی و بەرچاوی کاری میدیاییە،سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکانە،بۆیە هەر دەزگاییەکی ڕاگەیاندن گەر بیەوێ سەربەخۆ و پشتبەستوو بەخۆی لە گۆڕەپانەکە بەردەوام بێ،دەبێ وەك سەرچاوەی سەرەکی داهات پشتی پێببەستێ و فەرامۆشی نەکات،بەلاّم بێئەوەی کرداری ڕێکلامکردن کاربکاتە سەر میسداقییەت و لایەنی پیشەگەری دەزگاکە،لێرەوە لەپێناو ڕێکخستنی کرداری ڕێکلامی ڕۆژنامەگەری،بیرمەندانی میدیا کۆمەڵە بنەمایەکی ئیتیکیان دەسنیشانکردووە پێویستە دەزگا ئیعلامییەکان لە پرۆسەی ڕێکلامکردندا لەبەرچاوی بگرن و کاری پێبکەن،ئێمە لەم بەشەدا باس لە ئیتیکی ڕێکلامکردن دەکەین،بەلاّم سەرەتا بەکورتی ڕۆشنایی دەخەینە سەر مەفهومی ڕێکلام و جۆر و ئامانج و شێوازەکانی.

### پێناسەی ڕێکلام

چەمکی ڕێکلام چەمکێکی پڕ لە ئیشکالیەتە،زمانەوان و پسپۆران بە جۆر و شێوازی جیا جیا پێناسەیان کردووە،لە قاموسی(المحیگ) بە مانای هاوارکردن و پێڕاگەیاندن هاتووە،فەرهەنگی دەستەواژە ئیعلامییەکانیش وا پێناسەی کردووە کە "هەوڵێکی ئیعلامی ڕێکخراوە،بەئامانجی وەدەستهێنانی قازانج،هیچ پەیوەندی بە ئاڕاستەکردن و کارکردنەسەر ڕای گشتییەوە نییە"،بە واتایەکی دیکە ڕاگەیاندن لە ڕێگەی ڕێکلامەوە بانگەشە بۆ کەرەستە و کەلوپەلێکی بازرگانی دیاریکراو دەکات بە ئامانجی هاندانی بەکاربەر بۆکڕینی،وپڕفرۆشکردنی کەلوپەلەکە.

له دائیرەی مەعاریفی فەرەنسیشدا بریتییە "لە کۆمەڵە مەسژێکی ئیعلامی ئاڕاستەکراو بۆ جەماوەر بەرامبەر پارەیەکی دیاریکراو، لەپێناو ناساندنی بە دەستگایەکی بازرگانی یان پیشەسازی،یان هەر مارکە و کەلوپەلێك،و هاندانی بۆ کڕینی."

فەرهەنگی(لارۆس)یش لە بارەیەوە دەڵێت:" چەند ڕێگە و شێوازێکی پەیڕەوکراوە بۆ ناساندنی دەستاگەیکی بازرگانی و پیشەسازی و بەرهەمەکانی."

**أ/جۆرەکانی ڕێکلام**

پسپۆرانی میدیا بە پشتبەستن بە شێوەکانی بلاّوکردنەوی ڕێکلام،ڕێکلامیان بەسەر (١٠) جۆری سەرەکی دابەش کردووە،ئەوانیش:

١/ڕۆژنامە و گۆڤارەکان.

٢/وێنە و فیلمەکان.

٣/سینەما .

٤/پۆست و بەرید.

٥/رادیۆ .

٦/تەلەڤزیۆن.

٧/پۆستەرە لکێندراوەکان لە شوێنە گشتی، و هۆکانی گواستنەوەی گشتیدا.

٨/کتێب و نامیلکە ڕێکلامییەکان.

٩/تابلۆ ئەلیکترۆنییەکانی شەقام و شوێنە گشتییەکان.

١٠/ئینتەرنێت.

لەلایەکی دیکەوە هەندێك لە پسپۆران لە رووی جۆری ڕێکلامەوە،ڕێکلامیان بۆ دوو بەش دابشکردووە:

١/ڕێکلامی بازرگانی:وەك بانگەشەکردن بۆ کەرەستە یان کەلوپەل یان خزمەتگوزارییەکی بازرگانی دیاریکراو.

٢/ڕێکلامی نابازرگانی:وەك بانگەشەکردن بۆ ئایدیا و هزرێکی سیاسی یان کۆمەلاّیەتی دیاریکراو.

هەروەها چەند جۆرێکی دیکەی ڕێکلام هەیە،لەوانە:

١/ڕێکلامی درامی:ئەم جۆرە هاوشێوەی دراما،سیناریۆ و دیالۆگ لەخۆدەگرێت،چەند هونەرمەندێکیش نمایشی دەکەن.

٢/ڕێکلامی حکومی:دەوڵەت خۆی پشتگیری لەو جۆرە ڕێکلامانە دەکا و خەرجییەکانی لەخۆدەگرێت،بەئامانجی پارێزگاریکردن لە هێزی ئابووری و مرۆیی و سەرچاوەکانی وزە.

٣/ڕێکلامی خزمەتگوزاری:ئەو ڕێکلامەیە کە بانگەشە بۆ خزمەتگوزارییەکی دیاریکراو دەکات،و مەرج و شێوەکانی سوودوەرگرتن لێی بۆ خوێنەر یان گوێگر یان بینەران دەخاتە ڕوو.

٤/ڕێکلامی گۆرانی و مۆسیقا ئامێز:هەر فلمێکی ڕێکلامییە کە بەهۆی گۆرانی مۆسیقاوە نمایش بکرێت.

٥/ڕێکلامی ڕاستەوخۆی تەلەفزیۆنی:ئەو جۆرە ڕێکلامەیە کە بە دەنگ و وێنە لە تەلەفزیۆنەکان ڕاستەوخۆ دەگوازرێتەوە.

ب/ئامانجەکانی ڕێکلامکردن

پرۆسەی ڕێکلامکردن لەپێناو بەدیهێنانی کۆمەڵە ئامانجێکە،دەکرێ لەم خالانەی خوارەوە کۆیان بکەینەوە:

١/زامنکردنی پڕفرۆشی بەردەوام.

٢/خولقاندنی وەعی و شعورێکی باش بەرامبەر بەرهەمە بازرگانییەکانی کۆمپانیایەکی دیاریکراو.

٣/ئاسانکاریکردن بۆ نوێنەرانی تەسویق و فرۆشتن.

٤/درێژکردنەوەی وەرزی فرۆشتنی کەلوپەلێکی دیاریکراو.

٥/فراوانکردنی بازنەی بەکاربەران.

٦/راکێشانی کڕیاری زیاتر بۆ کەلوپەل و کەرەستەیەکی بازرگانی دیاریکراو.

تایبەتمەندییەکانی ڕێکلام

ڕێکلام هەڵگری کۆمەڵە خاسیەت و تایبەتمەندییەکە،دیارترینیان:

١/ڕێکلام بەشێکە لە پرۆسەی پەیوەندیکردنی جەماوەری،سەرجەم پێهکاتە و مەرجەکانی کرداری پەیوەندیکردن لەخۆدەگرێت.

٢/مادده ریکلامییە بلاوکراوەکان بەرامبەر پارەیەکی دیاریکراون کە پێشوەخت بە لایەنی بلاوکەر بەخشراون.

٣/ڕێکلام سەرجەم کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەکاردەهێنێ بو گەیاندنی پەیامەکەی.

٤/روون و ئاشکرایی لایەنی ڕێکلام بۆکراو لە پەیامی ڕێکلامکردندا.

٥/ریکلام ئاڕاستەی بەشێکی دیاریکراو لە بەکاربەران دەکرێت،کە پێشتر لایەنی مەعریفی و کۆمەلآیەتی و سایکۆلۆژیان لەلایەن لایەنی ریکلامکەرەوە دیراسەکراوە.

٦/هەولّی قەناعەتپێهێنانی بەکاربەر دەدات بۆ کڕینی بەرهەمی کۆمپانیایەکی دیاریکراو،ئەمەش واتای کارکردن لە سلوکی بەکاربەر دەگەیەنێت،لەڕێگەی ئەو چالاکییە گەیاندنییەی ئەنجامی دەدات.

## فاکتەرەکانی سەرکەوتنی ریکلام

کۆمەلّە هۆکارێك کاریگەرییان لەسەر سەرکەوتنی ریکلام هەیە،پسپۆران بەگشتی کۆکن لەسەر چەند فاکتەرێك،گرنگترینیان:

١/دووبارەکردنەوەی بەردەوامی بابەتە ریکلامییەکان.

٢/بەردەوامبوون.

٣/لەڕووی کاتەوە پێویستە هەر بابەتێکی ریکلامی لە نیو دەقیقە کەمتر نەبێ.

٤/پێویستە بە زمان و ئسلوبێك بێ تەواوی جەماوەر تێیبگات.

٥/ئاستی خوێندن و مەعریفی هاولآتیان.

٦/زۆری ژمارەی هاولآتیان و سەفەرکردن،هەروەها زۆری ژمارەی بازاڕ و مۆلّەکان،و پێشکەوتنی هۆکانی گەیاندن و کەرەستەکانی ریکلامکردن.

ج/گرنگی ریکلام بۆ کۆمەلّگەی هاوچەرخ

لە ئێستادا ریکلام دیاردەیەکی ئیعلامی و ئابووری و کۆمەلآیەتی بەرچاوە،هەموو کۆمەلّگەیەك،لە هەر ئاست و قۆناخێکدا بێ،بەجۆرێك لە جۆرەکان کرداری ریکلامکردن بەخۆیەوە دەبینێ،بگرە بۆ تاکی هەندێك کۆمەلّگە بۆتە زەرووڕەت و ناتوانن دەسبەرداری بن،کارمەندانی بواری ریکلام و بەشێك لە پسپۆرانی میدیا پێیان وایە ریکلام هەلّگری کۆمەلّە رەهەندێکی ئیعلامی و بازرگانی و کۆمەلآیەتییە،هەروەها کردارێکە لە کۆتاییدا بەسوودی وەرگر دەشکێتەوە.

لەرووی ئیعلامییەوە ئەوان سوودەکانیان بەم شێوەیە ریزبەند کردووە:

١/پەیامە ریکلامییەکان زانیاری پێویست دەگەیەننە بەکاربەر بۆ ئەوەی بەلێزانییەوە جۆری بەرهەم و پێداویستییەکانی رۆژانەی هەلّبژێرێ.

٢/ریکلام ژیان و رووی هەندێك کەلوپەلی سوودبەخش لای وەرگر جوانتر دەکات.

٣/رۆحی تەنز و گالّتەکردن لای وەرگر پەرە پێدەدات.

٤/هاوشێوەی هەندێك لە ژانرە رۆژنامەوانییەكان بۆ نموونە(وتار)،جۆرێك لە كرداری قەناعەتپێهێنانی تێدایە.

لەرووی كۆمەلاَیەتییەوەش هەندێك پێیان وایە لەبەر ئەوەی رێكلام بەهۆی دەزگاكانی راگەیاندنەوە دەچێتە هەموو مالَ و شوێنێك،دەبێتە فاكتەری كالَكردنەوەی جیاوازییە كەسییەكان،و نزیككردنەوەی پێكهاتەكانی كۆمەلَگە لەیەكتری.بەلاَم بەبۆچوونی من رێكلام هیچ سوودێكی كۆمەلاَیەتی و تارادەیەكیش ئیعلامی نییە،چونكە پەیامی راگەیاندن لەوە قولَتر و كاریگەرترە لەرێگەی رێكلامەوە بەجەماوەر بگەیەندرێت،یان بەهۆیەوە كاربكرێتە سەر رای گشتی،سەبارەت بە لایەنی كۆمەلاَیەتیش نازانم چۆن دەبێتە هۆكاری كالَكردنەوەی جیاوازییە كەسییەكان؟!یان نزیككردنەوەی پێكهاتەكانی كۆمەلَگە لەیەكتری!!لە كاتێكدا ئەو جیاوازییانە هەندێكی خەلَقین، بەزگماك هەر لەگەلَ لەدایكبوونی مرۆڤەوە بوونییان هەیە،هەندێكی دیكەشییان موكتەسەبن واتە وەرگیراون،ژینگە و شێوەی ژیان و كەش و هەوا و...تاد،رەنگرێژی كردوون،وكالَكردنەوەیان پێویستی بە كاری پسپۆرانی دەروون و كۆمەلاَیەتی هەیە و لەرێگەی چەند مەسژێكی رێكلامی سادە مەحالَە ئەو كارە قورسە ئەنجام بدرێت.

بۆیە دەكرێ بلَێین سوود و ئامانجی سەرەكی رێكلام لایەنی بازرگانی و قازانجە،كردارێكە لەپێناو پڕفرۆشكردنی كەلوپەل و كەرەستەیەكی دیاریكراو،یان بانگەشەكردن بۆ بەرهەمەكانی كۆمپانیا و كارگەیك ئەنجام دەدرێت بە مەبەستی وەدەستهێنانی زۆرترین قازانج،بێگومان هۆكانی راگەیاندنیش پشكییان لەو قازانجە دەبێ،بەڕای من گەر دەزگا ئیعلامییەكان بتوانن لە چوارچێوەی ئیتییكە باوەكانی رێكلام پرۆسەی رێكلامكردن ئەنجام بدەن،سوودێكی ماددی و مەعنەوی گەورە لە رێكلام وەردەگرن،یەكەمیان لەبەر ئەوەی دەبەێتە سەرچاوەیەكی گرنگی داهات،دووەمیان زامنكردنی داهات و سەرمایە لەرێگەی رێكلامەوە دەزگا ئیعلامییەكان لە زۆرێك لەو كاریگەری و كۆت و بەندە راستەخۆ و ناڕاستەوخۆیانە قوتاردەكات كە لە لایەن پارەبەخش(ممول)ەكانەوە بەسەر ئەو دەزگایانە دەسەپێندرێن، كە دەرئەنجام نێگەتیڤانە بەسەر سەربەخۆیی و لایەنی پیشەیی ئەو دەزگایانە دەشكێتەوە.

بەلاَم سەرباری زالَبوونی لایەنی قازانج و دەستكەوتی ماددی ،نابێ ئەوەمان لەبیربچێ كە رێكلام دوو خزمەتی گرنگ بە ئابووری ولاَت و بەكاربەر دەگەیەنێت:

١/هۆكاری ركابەری و مونافەسەیە لەنێوان كارگە و كۆمپانیاكان،ئەو مونافەسەیەش كاردەكاتە دابەزینی نرخەكان،ئەمەش دەرئەنجام بەسوودی بەكاربەر دەشكێتەوە.

٢/هۆكارێكه بۆ زۆرفرۆشي و بازاڕگەرمكردن و زۆربوونی خواست لەسەر كەلوپەل،ئەمەش ئۆتۆماتیكی كاردەكاتە سەر بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان،و دەرئەنجام باشبوونی بازاڕی كار و كەمبوونەوەی ڕێژەی بێكاری.

د/ڕەخنەگرتن لە ڕێكلام و خراپییەكانی

ڕێكلام وەك هەر كردارێكی بازرگانی و ئیعلامی بەدەر نییە لە كەموكوڕی،هاوكات دوور نییە لە ڕەخنە و پرۆتۆتستكردن،هەندێك نێوەند بەردەوام هێرش دەكەنە سەری و بە بێ سوود و وێرانكەر ناوی دەبەن،دەنگی ناڕەزایی دژ بە ڕێكلام سەرەتا لە زانكۆكان،بەتایبەت لە زاری ئەكادیمیستانی ئەمریكاوە بیسترا،تا بوو بە حاڵەتێكی جیهانی،هەنوكە ڕێكخراو و كۆمەڵەی تایبەت بۆ دژایەتیكردنی ڕێكلام دامەزراوە،ئەم ڕێكخراوانە بە هاریكاری چەند مامۆستایەكی زانكۆ لە ولاَتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، لائیحەیەكی ڕەخنەئامێزیان ڕاگەیاندووە،باس لە خراپییەكانی ڕێكلام لەسەر لایەنە جیاوازەكانی كۆمەڵگە دەكات،لائیحەكە ئەم خالاَنە لەخۆدەگرێت:

١/تێڕوانینێكی ساختە لە هەڵسەنگاندنی هەندێ بەرهەم و كەلوپەل دەگەیەنێتە وەرگر.

٢/ئاكاری كۆمەڵ دەشێوێنێ بەهۆی بانگەشەكردنی ناڕاستگۆی بەردەوام .

٣/كار لە مسداقییەتی هەواڵ و دەزگا ڕۆژنامەوانییەكان دەكات.

٤/بڕێكی زۆر لە دار و لاستیك و ڕەنگ و كەلوپەلی كیمیایی بەفیڕۆ دەدات.

٥/میزاج و زەوقی وەرگر دەشێوێنێ بەهۆی دووبارە و سەدبارەبوونەوەی بەردەوامی لە نێو بڕگە و دراما و بابەتە ڕۆژنامەوانییەكان.

٦/كێشە بۆ دایكان و باوكان دەخولقێنێ بەهۆی كاریگەری بەرهەمە ریكلامبۆكراوەكان لەسەر وەرگر.

٧/جیاوازییە كۆمەلاَیەتی و چینایەتییەكان قولتر دەكات.

٨/وادەكات ماددە و ژیانی رووكەش و مۆدی جل و بەرگ و ئۆتۆمبیل بەسەر لایەنە سەرەكییەكانی دیكەی ژیان زالبێت.

٩/پاوان و قۆرخكاری بۆ بەرژەوەندی كۆمپانیا زەبەلاحە پارەدارەكان قولتر دەكات،چونكە ئەوان بەهۆی زۆری سەرمایەوە پشكی شێرییان لە كرداری ریكلامكردن بەردەكەوێت.

١٠/لە ڕێگەی دەغدەغەدانی عاتیفە و ئیحساسەوە هانی بەكاربەر دەدات بۆ كڕینی هەندێك كەلوپەل كە پێویستی پێیان نییە.

١١/تێچوونی بەرهەمهێنان و فرۆشتنی كەلوپەل لەسەر بەكاربەر زیاد دەكات.

١٢/ریکلامکاران بەهۆی کرداری ریکلامەوە کاریگەری لەسەر دەزگا رۆژنامەوانییەکان دروست دەکەن.

لەم سەروبەندەدا هەندێك بەپشتبەستن بەو خراپی و رەخنانە دوو پێشنیارییان خستۆتەڕوو بۆ کەمکردنەوەی ئاسەوارە خراپەکانی ریکلام،پێشنیارێکیان داوای ئیلغاکردنی تەواوی ریکلام دەکات،ئەویدیکەشیان داوای کۆت و بەندکردنی دەکات لەرێگەی چاودێریکردنییەوە لەلایەن دەزگایەکی تایبەت و دانانی باجێکی زۆر لەسەری!!بەبۆچوونی نووسەری ئەم کتێبە نەك مەسەلەی ئیلغاکردن،بەڵکە چاودێریکردن و کۆت وبەندکردنی ریکلام مەسەلەیەکە قابیلی قەبوڵ نییە چونکە دژ بە ئازادی رادەربڕین و ئازادی رۆژنامەگەرییە،بۆیە بەتووندی دژی دەوەستم دەڵێم: شیاوترین رێگەچارە بلاوکردنەوەی کلتووری ئەخلاقیاتی ریکلامکردن،و هاندانی لایەنە بەشدرابووەکانی پرۆسەی ریکلامە بۆ پابەندبوون بە بنەما ئیتیکییەکانی ئەو بوارە.

## دووەم:ئیتیکی ریکلامکردن

رەخنەگرتن لە ریکلام و نیشاندانی کەموکوڕییەکانی بەشێك لە پسپۆرانی میدیا وپەروەردەی هێنا قسەکردن،ئەوان دوای راگۆڕینەوە و مشتومڕێکی زۆر گەیشتنە هاودەنگییەك سەبارەت بە دەسنیشانکردنی کۆمەڵە بەهایەکی ئیتیکی تا لەرێگەیەوە کرداری ریکلامکردن لە قالب بدرێ بەمەبەستی تەنزیم و رێکخستنی،دەتوانین بەها گشتییەکانی ئیتیکی ریکلامکردن لەمانەی خوارەوە کۆبکەینەوە:

١/نابێ ناوەڕۆکی پەیامە ریکلامییەکان ناکۆك بێ لەگەڵ بەها و ئەخلاقی کۆمەڵگە،یان منداڵ فێری درۆ و موبالغەکردن بکات.

٢/نابێ پەیامەکە هەڵگری مەسژی سێکسی بێ،یان ئاداب و ئەخلاقی گشتی بڕوشێنێ.

٣/نابێ بانگەشە بۆ بەها و عاداتی بێگانەی ناکۆك بە بەها و عاداتی گشتی بکات.

٤/نابێ پەیامەکە وشە و ئەڵفازی وا لەخۆبگرێت لە پێگە و کەسایەتی ئافرەت و خێزان کەمبکاتەوە.

٥/نابێ ریکلام بانگەشە بۆ ئەو جۆرە خواردن و کەلوپەلانە بکات کە کاریگەری خراپیان لەسەر تەندروستی هاولاتیان هەیە،وەك ریکلامکردن بۆ جگەرە و ماددە هۆشبەرەکان و داو و دەرمان و دەرزی .

٦/نابێ بەشێوەیەك بێ منداڵ هانی لاساییکردنەوە و کاری خراپ بدات.

٧/لەپێناو زامنکردنی متمانەی بەکاربەر،پێویستە راستگۆبێ لەو داتا و زانیارییانەی دەربارەی کەلوپەلە رێکلامبۆکراوەکان دەیخاتەڕوو.

سەبارەت بە ئیتیکی ئەو کارمەندانەش کە لە بواری رێکلامدا کاردەکەن،هەر هەمان ئەو پسپۆڕانەی میدیا و پەروەردە چەند بنەمایەکیان دیارکردووە،ئەوانیش:

١/بایەخدان بە لایەنی راستگۆیی پەیامە رێکلامییەکان،بەجۆرێك کەلوپەلە رێکلامبۆکراوەکان هەڵگری ئەو خەسیەت و باشیانە بن کە بانگەشەیان بۆ دەکرێت.

٢/پێویستە ناوەڕۆکی پەیامەکان بەشێوەیەك دابڕێژرێن هاوکۆك بن لەگەڵ یاساو ئایین و رێسا و عاداتی کۆمەلآیەتی.

٣/نابێ بەشێوەیەك دابڕێژرێن ئیماژ و هێمای ئەوتۆیان تێدابێ لە بەهای کەلوپەل و بەرهەمی کۆمپانیاکانی دیکە کەم بکەنەوە.

٤/نابێ رێکلام بۆ ئەو کەرەستانە بکرێ کە بەشێوەی ساختە هێمای بازرگانی کۆمپانیای دیکە دەدزن، و بە بەرهەمەکانی خۆیانەوەی دەلکێنن.

لەلای خۆشییەوە نەتەوەیەکگرتووەکان لائیحەیکی ئەخلاقی تایبەت بە چۆنیەتی مامەڵەکردنی رۆژنامەنووسان لەگەڵ رێکلام،و کۆمپانیا بازرگانی و دەزگا رێکلامییەکان دارشتووە،کە پێنج خاڵی سەرەکی لەخۆدەگرێت:

١/رۆژنامەنووس دەبێ لەکاتی نووسینی بابەتە رۆژنامەوانییەکان خۆی لە رێکلامی بازرگانی بەدوور بگرێت.

٢/نابێ رۆژنامەنووس یارمەتی دارایی لەبری بلاْوکردنەوەی بانگەواز،یان رێکلامێکی حکومی لە دەوڵەت وەربگرێ،چونکە ئەوەی بەو کارە هەڵدەستێ خودی دەزگاکەیە نەك رۆژنامەنووس.

٣/نابێ رۆژنامەنووس ببێتە مەندوبی رێکلامکردن بۆ هیچ دەزگا و کۆمپانیایەك،یان واژۆ لەسەر هیچ مارکە و ماددەیەکی رێکلامبۆکراو بکات.

## سێیەم:دەستوری نێودەوڵەتی ئەخلاْقی رێکلامکردن

بیرۆکەی ئەم دەستوورە لەدەستپێشخەرییەکەی ژوری بازرگانی نێودەوڵەتییەوە سەرچاوە دەگرێ کە ساڵی ١٩٣٧ لەمیانی کۆنگرەی بەرلیندا خستییەڕوو،دەستوری نێوبراو چوار بنەمای سەرەکی و چەند خاڵێکی لاوەکی لەخۆدەگرێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم**:بنەما سەرەکییەکان:ئەم بنەمایانە بە کۆڵەگەی کرداری رێکلامکردن دادەندرێت لە ئاستی نێوخۆیی و نێودەوڵەتیدا،ئەویش چەند خاڵێك لەخۆدەگرێت:

١/ڕێكلام خزمەتگوزارییەكی گشتییە،سەركەوتنی بەندە بەرادەی متمانەی جەماوەرەوە،بۆیە نابێ ڕێگە بە هیچ كردارێك بدرێت لە متمانەی كەمبكاتەوە.

٢/پێشكەوتنی ڕێكلام پەیوەستە بە رادەی هاریكاری كاركەرانی ئەو بوارە،پێویستە ڕێگە بەهیچ كردارێك نەدرێت ببێتە مایەی خاوكردنەوەی ئەو هاریكارییە.

**دووەم**:ئەو بنەمایانەی ئامانج لێیان وەدەستهێنانی متمانەی جەماوەرە:ڕاستگۆیی ماددە ڕێكلامییەكان فاكتەری زامنكردنی متمانەی جەماوەرە،ناڕاستی زانیاری لە ڕێكلامدا تەنها زیان بە بەكاربەر ناگەیەنێ،بەڵكە بە تەواوی ڕێكلامكاران و پرۆسەی ڕێكلامكردن،بۆیە دەبێ ڕێكلام وردبین بێ لە خستنەڕووی زانیاری دەربارەی:

١/تایبەتمەندی كەرەستەكان.

٢/نرخیان.

٣/ئەو خزمەتگوزارییانەی كە هاوشانی كەلوپەلەكەن،وەك،خزمەتگوزاری گەیاندنی بۆ دەستی كڕیار،سیانە و چاككردنەوە،گۆڕینەوە.

٤/لەو ڕێكلامانەی پەیوەستن بە نەخۆشەوە،نابێ تیایاندا گرەنتی چارەسەری تەواو بە نەخۆش بدرێت.

٥/نابێ ڕێكلام بۆ كاری سیحرباز و بەخت بەخت خوێندنەوە بكرێت.

**سێهەم**:ئەو بنەمایانەی پەیوەندی نێوان ڕێكلامكاران ڕێكدەخەن:پێویستە بەرهەمهێنەر و خودان كۆمپانیاكان بەر لە ڕێكلامكردن بۆ كەلوپەلەكانیان لە نێوان خۆیاندا لەسەر دابەشكردنی ناوی ئەو ماركە بازرگانی و كەلوپەلانە ڕێكبكەون كە لێك نزیكن.

چوارەم:ئەو بنەمایانەی پەیوەستن بە ئاژانسەكانی ڕێكلامكردن و هۆكانی ڕاگەیاندن:لە پرۆسەی ڕێكلامدا سێ لایەنی سەرەكی ڕۆڵ دەبینن،و هەریەكەیان بەرێژەیەك بەرپرسیارییەتیان دەكەوێتە ئەستۆ،ئەوانیش لایەنی ڕێكلامكار،وەكیل و ئاژانسەكانی ڕێكلامكردن،و دەزگاكانی ڕاگەیاندن،ئەم سێ لایەنە لەپێناو بەرێوەچوونی ڕێكلام بەشێوەیەكی زانستی و تەندروست،پێویستە رەچاوی ئەم خالانە بكەن:

١/مافی لایەنی ڕێكلامكارە زانیاری پێویست لەو دەزگا ئیعلامییانە وەربگرێ كە پەیامەكەی تێدا بلاودەكاتەوە،بەتایبەت زانیاری دەربارەی،كات و شوێنی بلاوكردنەوەی ڕێكلامەكە، و ئاست و سروشت و جۆری جەماوەری دەزگاكە.

٢/پێویستە دەزگا رۆژنامەوانی و ئاژانسەکانی ریکلام بە ئەخلاقەوە رکابەری لەسەر راکێشانی بەرهەمهێنەر و کۆمپانیاکان بکەن،و مونافەسەکردنیان لەسەر حیسابی وەلاوەنانی بنەما ئیتیکییەکانی ریکلام نەبێ.

## ریکلام لە راگەیاندنی کوردیدا

بابەتی ریکلام بابەتێکی نوێیە لە راگەیاندن و کۆمەڵگەی کوردیدا،تەجرەبەی میدیای کوردی لەگەڵ ریکلام تەجرەبەیەکی کورتە،تەنها حەفت هەشت ساڵێکە رۆژنامەگەری کوردی بەشێوەیەکی بەرفراوان مامەڵەی لەگەڵ دەکات،فراوانبوونی مەودای کاری تەلفزیۆنی و زۆربوونی کەناڵە **TV** لۆکاڵ و ئاسمانییەکان،بازدانێکی جۆریان بە ریکلام لەرووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە کرد،گەر لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوو ریکلام لە گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان حزوری هەبووبێ،ئەوا حزورێکی شەرمنانە و سادە بووە،بە بەراورد لەگەڵ ئێستا، هیچ پیگە و پانتاییەکی نەبووە.

وەك ئاماژەمان پێدا هەنووکە ریکلام لە میدیای کوردیدا زۆر جیاوازە لەگەڵ دە ساڵ پێش ئێستا،بەلاّم نووکەش وەك ئاستی پێویست نییە،بەتایبەت گەر بەراوردی بکەین بەو زۆری و بۆرییەی لە هۆکانی راگەیاندنی کوردیدا دەبیندرێت،هێشتا تەحەدایەکی زۆر لەبەردەم ریکلامی کوردیدایە،ئاستەنگ و گرفتەکانی زۆرن،گەر بمانەوێ ئەو تەحەدایانە دەسنیشان بکەین بەبۆچوونی من گرفتەکان لە خودی لایەنە سەرەکییەکانی پرۆسەی ریکلامەوە سەرچاوە دەگرن،کە جەماوەر،و کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنان،و هۆکانی راگەیاندنن ،بۆ شیتەڵکردنی هەریەك لەو لایەنانەش من دەڵێم:

١/هێشتا وەرگر یان بەکاربەری کوردی بەچاوی گومانەوە لە مەسەلەی ریکلام دەڕوانێ، خەڵکانێکی زۆر بۆچوونیان وایە کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنان،یان بازرگانەکان ریکلاّم بۆ ئەو جۆرە کالاّ و کەرەستانە دەکەن کە کوالێتیان لە ئاستێکی نزمدایە،یان لەبازاڕەکان ماونەتەوە و کڕیارییان نییە،بەدگومانی وەرگری کوردی لە ریکلام هەندێ جار بە خراپە و سلبیات بەسەر دەزگا رۆژنامەوانییەکان دەشکێتەوە،لەوانەیە مسداقیەتی بخاتە ژێر پرسیارەوە.

٢/کۆمپانیا و بازرگانان،یان روونتر بڵێین ئەوانەی ریکلام بۆ کالاّکانیان دەکەن بەگشتی ئیلتیزام بە ئیتیکی ریکلامکردنەوە ناکەن،خەمی سەرەکی ئەوان بانگەشە و پڕوپاگەندەکردنە بۆ کالاّکانیان بە ئامانجی بازاڕخۆشکردن و قازانج،بێ رەچاوکردنی هیچ ئیعتیبارێکی کۆمەلاّیەتی و ئاکاری،وەك لەبەرچاوگرتنی هەست و خواستەکانی وەرگر و عاداتی کۆمەڵگە،لە هەمووشی خراپتر ریکلام کردنە بەپلەی یەك بۆ کالاّی بیانی و فەرامۆشکردنی بەرهەمە نێوخۆییەکان.

٣/سەبارەت بە دەزگاکانی راگەیاندنیش،بێگومان ئەوانیش بەشێکی زۆر لە ئۆباڵی کەموکورتیەکانی ئەو بوارەیان دەکەوێتە ئەستۆ،ئەوان بەگشتی بەلاّم نەك بەشێوەیەکی رەها رەچاوی بنەما ئاکارییەکانی رێکلامکردن ناکەن،دەکرێ سلبیاتی دەزگا رۆژنامەوانییەکان لەم خالأنەدا بخەینەڕوو:

أ/رەچاونەکردنی هەست و شعوری جەمعی جەماوەر لە پەیامە رێکلامییەکان و عادات و ئاستی ئابووری زۆرینەی کۆمەڵگە،کە لەوانەیە ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر چینە جیاجیاکانی گۆمەڵگە هەبێ،و دەرئەنجام بە قوڵکردنەوەی جیاوازییە چینایەتییەکان بشکێتەوە.

ب/رەچاونەکردنی هەستیاری کەسایەتی منداڵ و هەرزەکاران لە خستنەڕووی پەیامە رێکلامییەکان.

ج/بەکارهێنانی ئەلفاز و وشەی نادروست و بازاڕی لە پەیامەکاندا،بەتایبەت لەوانەی بەشێوەی دراما بلأودەکرێنەوە.

د/لە رێکلامە درامییەکاندا سیناریۆی زۆر نابەجێ و نەگونجاو بەکاردێت،وەك شەڕکردن و بەکارهێنانی چەك و چەقۆ،شەڕەجوێن و...تاد،لەهەمووشی خراپتر ئەوەیە کە ئەو جۆرە رێکلامانە زیاتر ئاڕاستەی منداڵاّن دەکرێت،یان پەیوەستن بە کالأ و کەرەستەی منداڵاّنەوە،و هانی منداڵاّن دەدەن بۆ لاسایکردنەوە!!

م/لە کوردستاندا تا ئێستا دەزگا و کۆمپانیای پرۆفیشناڵی رێکلامکردن،بگرە سادە و کەم ئەزموونیش نییە،ئەوەی هەشە لەڕووی تەکنیك و ناوەڕۆکەوە سادە و لاوازە،ئەمەش وایکردووە هەر خودی دەزگا ئیعلامییەکان بە دوو وەزیفە هەستن،ئەویش بەرهەمهێنانی ماددە رێکلامییەکان،و بلأوکردنەوەیانە،لەکاتێکدا بەرهەم هێنانی رێکلام وەزیفەی دەزگاکان نییە،ئەم کارە رەنگدانەوەی خراپی لەسەر خودی پرۆسەی ریکلامکردن و دەزگاکانەوە هەیە،چونکە بەم شێوەیە ماددە رێکلامییەکان لە لایەن خەڵکی ناپسپۆڕەوە دادەڕێژرین کەئەمەیش کار لە ماهیەت و ئامانجی ماددە رێکلامبۆکراوەکە دەکات،هاوکات مسداقییەتی دەزگا ئیعلامییەکانیش دەخاتە ژێر پرسارەوە.

ن/هەندێ دەزگای ئیعلامی،بەتایبەت **TV** لۆکاڵەکان رێکلام بۆ هەندێ داو و دەرمانی پزیشکی دەکەن بێ ئەوەی وەسفەی پزیشکیان هەبێ،ئەمەش سەرپێچیکردنی ئیتیکی رێکلامە کە بەهیچ شێوەیەك رێگە بە بانگەشەکردن بۆ دەرمانی پزیشکی نادات.

ه/هەندێك رێکلام بۆنی کەمکردنەوە و شکاندنی بەرهەم و کەلوپەلی دیکەی لێدێ لە رێگەی بەکارهێنانی وشەو ئەلفازی وەك(بەرهەمەکانمان بێ هاوتان لەکوردستان،یان باشترین و جوانترینن،نرخەکانمان بێ هاوتان،گرەنتی چارەسەری سەد دەرسەدت پێدەدەین...تاد)

و/دەزگا ئیعلامییەکانی کوردستان بەبەراورد بە بێگانەکان بەرامبەر پارەیەکی یەگجار کەم ڕێکلام بۆ کۆمپانیا و بازرگانان دەکەن،سەرباری هەرزانی نرخی بلاٌوکردنەوەی ڕێکلام کەچی هێشتا ژمارەیەکی زۆر لەو دەزگایانە ڕێکلامیان سنووردارە،یان هەر نییە،ئەمەیش وایکردووە داهاتی ڕێکلام نەبێتە داهاتی سەرەکی دەزگاکان و مایەی خۆبەڕێوەبردنیان، و دەرئەنجام بە پاشکۆ مانەوەیان بۆ ئەو لایەنانەی تەمویلیان دەکەن، بشکێتەوەچونکە بەپێی زانیارییەکانی من ژمارەی ئەو دەزگا میدیاییانەی بەهۆی ڕێکلامەوە خۆیان بەڕێوەدەبەن لە(٤)دەزگا تێپەڕ نابێ،ئەمەش ژمارەیەکی یەکجار کەمە بە بەراورد لەگەڵ زۆری ژمارەی رادیۆ و **TV**و ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتە کوردییەکان.

ڕێکلامی زانستیانە و دروست سوودێکی مەزن بە دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان دەگەیەنێ،داهاتێکی باشیان وەدەست دەخات،بەبڕوای من ڕۆژنامەگەری کوردی لە هەر ڕۆژنامەگەرییەکی دیکە پێویستی بە داهاتی ڕێکلامە،داهاتی ڕێکلام بۆی هەیە زۆرینەی دەزگا ڕۆژنامەوانییە کوردییەکان لە بازنەی مشەخۆری و پاشکۆییەتی دەربکا و بیانخاتە سەر ڕێگەی راست کە پشتبەستنە بە داهاتی خودی سەربەخۆ، کە دەرئەنجام سەربەخۆیی کارکردن و قوتاربوون لە گشت لێکەوتەکانی تەمویلکردن بەدوای خۆیدا دێنێ.

## ئیتیك لە ڕۆژنامەگەری کوردیدا

ئەگەرچی ڕەگە هزرییەکانی مەسەلەی ئیتیك بۆ نزیکەی سەد ساڵ بەر لە ئیستا دەگەڕێتەوە،کاتێك ساڵی ١٩١٦ لە ولاٌتی سوێد یەکەمین پەیپەرنامەی ئەخلاٌقی ڕۆژنامەگەری ڕاگەیەندرا، وەلێ سەروکاڵی میدیای کوردی و ڕۆژنامەنووسان لەگەڵ ئەم بابەتە،نوێ و هەنووکەییە، تا چەند ساڵێك پێش ئێستا بەشێوەیەکی گشتی ڕۆژنامەنووسان زانیاری سەرەتایشیان لەم بارەیەوە نەبوو،تا ئەو کاتەی بەدەستپێشخەری کۆمەڵە ڕۆژنامەنووسێك و بەهاوکاری سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان (پەیماننامەی شەرەفی کوردستانی) راگەیەندرا کە ١٨ خاڵ لەخۆدەگرێ، و بە گشتی جەخت لەسەر خولْقاندنی هاوسەنگی لەنێوان ماف و بەرپرسیارییەتیەکانی ڕۆژنامەونووسانی کوردستان دەکات.

هەنووکە کە چەند ساڵێك بەسەر راگەیاندنی ئەو پەیماننامە ئاکارییە تێپەڕدەبێت،بە پێی زانیارییەکانی من هێشتا ئاگاداری ڕۆژنامەنووسانی کوردستان دەربارەی ئەم بابەتە لە ئاستێکی سەرەتایی دایە،بەڵکە دەتوانم بڵێم بەشێکی زۆریان تەنها ناوەکەیان بیستووە بێ ئەوەی هیچ زانیارییەکیان دەربارەی ناوەڕۆك و مەدلولاتی هەبێ.

رۆشنبیری رۆژنامەنووسانی کوردستان دەربارەی ئیتیك رۆشنبیرییەکی سادە و متەوازیعە،هەر ئەمەیشە وایکردووە رۆژانە بە شکل و شێوەی جیا جیا ئیتیکی پیشەی رۆژنامەوانی پێشێل بکرێت.شکل و ئاستەکانی ئەم پێشێلکردنەش لە چەند ئاست و لایەکەوە ئەنجام دەدرێت،هەندێکیان پەیوەستن بە خودی رۆژنامەنووسانەوە،هەندێکی دیکەشیان بە دەزگا ئیعلامییەکان،لایەنی سێهەمیش پەیوەنداری مامەڵەی حکومەت و داو ودەزگاکانیەتی لەگەڵ میدیاکاران.دەکرێ پێشێلکارییە ئیتیکییەکانی لە رۆژنامەگەری کوردیدا بە شێوەیەکی گشتی بەم شێوەیە شیتەڵ بکەین:

یەکەم: سەبارەت بە پێشێلکارییە ئاکارییەکانی رۆژژنامەنووسانی کوردستان دەبێ ئەوە بڵێین کە تەنها ژمارەیەکی دیاریکراو لە رۆژنامەنووسان دەگرێتەوە و ناکرێ بە گشتی و رەهایی قسەبکەین،شێوەکانی ئەو پێشێلکاریانەش چەند لایەنێك لەخۆدەگرێت،لەوانە،هەندێك رۆژنامەنووس پیشەکەیان دەخەنە خزمەتی تایبەتی خۆیانەوە و بۆ راییکردنی کارەکانیان لە دامودەزگا حکومییەکان،بۆ ئەم مەبەستە سوود لە کەسایەتی مەعنەوی رۆژنامەنووس وەردەگرن ،یان بەرامبەر موکافەئە و دەستکەوتێکی ماددی چاوپێکەوتن و دیمانە ساز دەدەن،یان هەندێ جار بێلایەنانە کارناکەن و دەبنە داکۆکیکار و بلندگۆی کەسایەتییەك یان لایەنێکی سیاسی دیاریکرا و لەسەر حیسابی لایەنێکی دیکە،لەم ماوەیەی دوایشدا جۆرێکی دیکەی ئیتیك بەزاندن سەریهەڵداوە ئەویش خۆی لە رومالکردنی هەواڵ و چالاکییەکانی کۆمپانیا بازرگانییەکان دەبینێتەوە کە زۆرجار شێوەی رێکلام وەردەگرێ،بەرامبەر پێدانی موکافەئە یان بەرهەمێکی کۆمپانیاکە بە رۆژنامەنووسەکە، یان ئەنجامدانی گەشتی بەخۆڕایی بۆ رۆژنامەنووسان لەبەرامبەر هاریکاریکردن لە بلاوکردنەوەی چالاکی کۆمپانیاکان.

لە هەندێك دەزگای رۆژنامەوانیشدا پێشێلکارییە ئاکارییەکان نێوانی رۆژنامەنووسانی گرتۆتەوە،وەك هەوڵدان بۆ جێگرتنەوەی یەکتری،یان موزایەدەکردن لەسەر یەگدی، و کارکردن بە کرێیەکی کەمتر لەو کرێیەی هاوکارانی کاریان پێدەکرد.

دووەم: سەبارەت بە دەزگاکانیش پێشێلکارییەکان جۆراوجۆرن،وەك کۆتاییهێنان بە خزمەتگوزاری رۆژنامەنووسان بێ پێدانی مافەکانیان،و رازینەبوون بە بەستنی گرێبەستی یاسایی لەگەڵ رۆژنامەنووسان،یان پۆزش نەهێنانەوە لەکاتی هەڵەکردن بۆ ئەوانەی بەهۆی هەندێ هەواڵ و بابەتەوە کەسایەتی و شعورییان بریندار دەکرێ،هەروەها رەچاونەکردنی شعور و دابی گشتی لەکاتی بلاوکردنەوەی هەندێك هەواڵ و وێنەدا.

سێهەم:هەرچی گرێدراوی حکومەت و دامودەزگاکانییەتی ئەوا پێشێلکارییە ئیتیکییەکان بەردەوام و دووبارەن،چەندین شێوەش وەردەگرن،لەوانە،پێنەدانی زانیاری بە رۆژنامەنووسان،و

ڕێگەگرتن لە رووماڵکردنی هەندێ ڕووداو، و ،شکاندن و دەسبەسەرداگرتنی پۆلیس بەسەر کەلوپەلی ڕۆژنامەنووسان، و مامەڵەی تووند و نابەجێ لەگەڵیان.

لەراستیدا بەواقیعکردنی مەسەلەی ئیتیك لە نێوەندی ڕۆژنامەگەری کوردی و گۆشتکردنی ڕۆژنامەنووسان بە بنەما ئاکارییەکانی پیشەکەیان، پێویستی بەکاری خێرا و جدی هەیە،چونکە ئێمە لەم ڕووەوە هێشتا لە دەسپێك و سەرەتاداین و ئەرکێکی زۆرمان لە ئەستۆیە،هەر بۆیە لێرە لەپێناو برەودان بەو بابەتە،و چەسپاندی پرسی ئیتیك لە ڕۆژنامەگەری کوردیدا چەند پێشنیارێك دەخەمەڕوو:

١/سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان و سەنتەری میترۆ و سەرجەم نێوەندەکانی دیکەی داکۆکیکردن لە ڕۆژنامەنووسان،بە راوێژکردن لەگەڵ دەزگا ئیعلامییەکان پێداچوونەوە بە(پەیماننامەی شەرەفی کوردستانی)بکەن،بەمەبەستی فراوان و گشتگیرکردنی.

٢/سەندیکای ڕۆژنامەنووسان لە پێناو بلاْوکردنەوەی ڕۆشنبیری پیشەیی، بەهاوکاری پسپۆرانی ئەو بوارە، ناوە ناوە نامیلکەی تایبەت بەچاپ بگەیەنێ و بەسەر دەزگا و ڕۆژنامەنووسانی دابەش بکات.

٣/پەرلەمانی کوردستان پەلە بکات لە ئیقرارکردنی یاسای مافی وەدەستهێنانی زانیاری.

٤/زانکۆ و نێوەندەکانی چاپ و توێژینەوە، کتێب و توێژینەوەی ئەکادیمی لەسەر ئەم بابەتە ئامادە بکەن.

٥/هەوڵبدرێت هەر دەزگایەکی ڕۆژنامەوانی پەیپەرێکی ئیتیکی تایبەت بەخۆی هەبێ،کە کارمەندانی وەك گرێبەستێکی ویژدانی لە نێوان خۆیان لەسەری ڕێکبکەون.

# سەرچاوەكان


١/ د.إبراهيم المسيلمى،التشريعات الإعلاميه،دار الفكر العربى،القاهره،٢٠٠٣م.

٢/ بسام المشاقبه:

أ/نظريات الإعلام،دار أسامه للنشر و التوزيع،الگبعه الاولى،عمان-أردن٢٠١١م.

ب/أخلاقيات العمل الإعلامى،دار أسامه للنشر و التوزيع،الگبعه الۆولى،عمان-أردن، ٢٠١٢م.

٣/جون هاتلنج،أخلاقيات الصحافه،ت:كمال عبدالرۆوف،الدار العربيه للنشر و التوزيع،بيروت.

٤/ د.حسن المكاوى،أخلاقيات العمل الإعلامى،الدار اللبنانيه المصريه،٢٠٠٤م.

٥/ د.حسين عبدالجبار،إتجاهات الإعلام الحديپ،دار أسامه،عمان-أردن،٢٠٠٨م

٦/ د.سلامه موسى،حريه الفكر و أبگالها فى التاريخ،دار التنوير.

٧/ د.ليلى عبدالمجيد،تشريعات الإعلام،العربى للنشر و التوزيع،٢٠٠١م.

٨/ د.محمد صاحب سلگان،إداره المۆسسات الإعلاميه،دار المسيره للنشر و الگباعه،عمان-أردن،٢٠١١م.

٩/ محمد ساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)،رۆژنامەنووسی پرۆڤیشناڵ و ئیتیکی رۆژنامەوانی،بلاْوكراوەی ئەكادیمیای كوردی،هەولێر،٢٠١٠م.

١٠/ د.محمد منير حجاب،الاعلام و الموچوعيه،دار الفجر،مصر،٢٠١٠م.

١١/ د.موسى على الشهاب،إتجاهات معاصره فى كتابه المقال الصحفى،دار أسامه للنشر و التوزيع،الگبعه الۆولى،عمان-الاردن، ٢٠١٢م.

١٢/ د.ولاو فائز الهندى،الإعلام و القانون الدولى،دار أسامه للنشر والتوزيع،الگبعه الۆولى،بيروت-لبنان، ٢٠١١م.

١٣/ أخلاقيات الإعلام و الفچائيات،أعمال المۆتمر العالمى،الدار اللبنانيه المصريه،٢٠٠٥م.

١٤/ یاسای ژمارە (٣٥)ی ساڵی ٢٠٠٧،یاسای رۆژنامەگەری كوردستان.

-چەند وتار و بابەتێك لە سایتە ئەلیكترۆنییەكانی،**bbc** عەرەبی،ئەلجەزیرە نێت، رۆیتەرز،شەرقلئەوسەت،


**نووسەر ٢٩ی سێپتێمبەری ٢٠١٢**

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا

_ساڵی ١٩٧٦ لە دایك بووە.

_هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە زمانی عەرەبی،زانکۆی سەلاحەدین،کۆلیژی ئاداب.

_هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە رۆژنامەگەری لەسەر نامەی(فن المقاله الصحفیه فی جریده التئاخی،دراسه فنیه-تحلیلیه)،زانکۆی بەیروت_لبنان.

_لە ساڵی ١٩٩٨ ەوە لە بواری رۆژنامەنووسی کاردەکات،لەم رۆژنامە وگۆڤارانە کاری کردووە:

نووسەر لە گۆڤاری (زاگرۆس) ١٩٩٨_١٩٩٩ کە بەزمانی عەرەبی دەردەچوو.

پەیامنێر لە گۆڤاری (هەرێم) ١٩٩٩_٢٠٠٥.

پەیامنێر لە (گۆڤاری گولانی عەرەبی) ٢٠٠٣-٢٠٠٤.

زمانەوان لە گۆڤاری (الصوت الاخر)ی عەرەبی ٢٠٠٤_٢٠٠٧.

ئەندامی دەستەی نووسەران،بەرپرسی فایلی کۆمەلایەتی لە گۆڤاری گولان ٢٠٠٧_٢٠١٠.

ئەندامی دەستەی نووسەران لە هەفتەنامەی (هەرێمی کوردستان) ٢٠٠٥_.

ئەندامی دەستەی نووسەران لە گۆڤاری (تورکیاناسی).

_چالاکوانە لە بواری کۆمەڵگەی مەدەنی و کاری رێکخراوەیی،تا ساڵی ٢٠١١ بەرپرسی سەنتەری(رەهەند) بوو بۆ چالاکی رۆشنبیری.

_لە بواری وەرگێڕانیشدا کاردەکات،چەندین توێژینەوەی ئەکادیمی لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی،و بە پێچەوانەوەش،وەرگێڕاوە.

_کتێبێکی وەرگێڕدراوی هەیە دەربارەی رۆژنامەگەری،بە ناونیشانی(دەروازەیەکی تیۆری و پراکتیکی بۆ رۆژنامەگەری رۆژانە و راگەیاندن).

_ستوون نووس بووە لە چەند رۆژنامە و گۆڤارێك.

_بە وتار و بابەتی رۆژنامەوانی،بەشداری بەردەوامی لە رۆژنامە نێوخۆیی وعەرەبییەکان هەیە.

_ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە.

_ئەندامی فدراسیۆنی نێودەوڵەتی رۆژنامەنووسانە.

_ئەندامی سەنتەری(نور)ی رۆشنبیری و ئیعلامییە لە سوید.